ئەم چاپ
دووەمە

# قەڵای موسڵمان

# لە ذیکرەکانی ڕۆژانەو شەوانە لە قورئان و سوننەتدا

کۆکردنەوەو ئامادەکردن و وەرگێڕانی
**حەمزە بەرزنجی**

پێداچوونەوەی
**مامۆستا عبدالکریم**

# قه‌لای موسڵمان

## له ذیکره‌كانی
## رۆژانه‌و شه‌وانه
## له قورئان و سوننه‌تدا

كۆكردنه‌وه و ئاماده‌كردن و وه‌رگێڕانی
حه‌مزه به‌رزنجی

پێداچونه‌وه‌ی
مامۆستا عبدالكریم

چاپی سی و شه‌ش

١٤٢٩ك ٢٠٠٨ز

بسم الله الرحمن الرحيم

تێبینی: نرخی جوملە بە: (١٢٠٠) دینارە. بۆ بەدەست خستنی ڕوو بکەرە چاپخانەی (شارستان) نزیک بەریدەکەی سلێمانی.. تەلەفون: ٠٧٧٠١٤٤١١٨٢

hamzabarzngy@yahoo.com

---

ناوی کتێب: قەڵای موسڵمان لە زیکرەکانی ڕۆژانەو شەوانە لە قورئان وسوننەتدا

کۆکردنەوەو ئامادەکردن و وەرگێرانی: حەمزە بەرزنجی

تیراژ:

نۆبەی چاپ: سێ و هەشت

چاپ: چاپخانەی شارستان

ژمارەی سپاردن (١٤٦)ی ساڵی ١٩٩٨ ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێ دراوە.

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

« إنَّ الحمد لله نحمدهُ ونستعينهُ ونستغفرهُ، ونعوذُ بـالله مـن شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضلَّ له، ومن يُضلل فَلا هادي لهُ، وأشهدُ أن لا إله إلا الله وحدهُ لا شريك له، وأشهدُ أنَّ محمَّدا عبدُهُ ورسولُهُ.

﴿ ياأيُّها الذين آمنوا اتَّقوا الله حقَّ تُقاته ولا تـموتُنَّ إلاَّ وأنـتُم مُسلِمون ﴾ (آل عمران: ١٠٢)

﴿ ياأيُّهـا النَّاسُ اتَّقوا ربَّكُمُ الَّذي خلَقكم مِنْ نفسٍ واحدَةٍ وخلَقَ مِنها زوجَها وبثَّ مِنهُما رجالاً كثيراً و نِساءاً واتَّقوا الله الذي تَسآءلون به وَالأرحامَ إنَّ الله كان عليكُمْ رقيباً ﴾ (النساء: ١)

﴿ ياأيُّها الذين آمنوا اتَّقوا الله وقولوا قولاً سديداً يُصلِحْ لَكُمْ أعمالَكُم ويَغفِر لكُمْ ذنوبكم ومَنْ يُطعِ الله ورسولهُ فَقدْ فازَ فوزاً عظيماً ﴾ (الأحزاب: ٧٠-٧١)

أما بعدُ فإنّ أصدقَ الحديث كتابُ الله. وخيرَ الهدي هدي محمّد(ﷺ)، وشرّ الأمور مُحدثاتها. وكلّ مُحدثة بدعة. وكلّ بدعة ضلالة. وكلّ ضلالة في النّار».

مرۆڤ ئەو زیندەوەرەیە کە مەبەست و ئامانج و ئەرکی سەرشانی بۆ دیاریکراوەو بەرنامەیەکی تێرو تەواوی بۆ داڕێژراوە لەلایەن خوای خاوەنیەوەو پێویستە بیکات بەکاڵای بالای، ئەو بەرنامەیەش هەر لەدایک بوونەوە هەتاکو مردن و لەهەستانەوەوە هەتاکو خەوتنەوەو هەموو کاتەکانی تری ژیانی گرتۆتەوە. بۆیە شارەزابوون بەو بەرنامەیە ئەرکی سەرشانیەتی، وەئیکرەوکانیش بەشێکە لەبەشە سەرەتاییەکانی ئەو بەرنامەیە.

پاش ئەوەی چاپی یەکەم و دووەم و سێیەمی نامیلکەی (قەلای موسڵمان لە ذیکرەکانی ڕۆژانەو شەوانە لەقورئان و سوننەت دا) کەوتە بازاڕەوە. موسڵمانان بەتامەزرۆو پەرۆشەوە باوەشیان بۆی گرتەوەو دیاربوو تاڕادەیەك جێی خۆی دیاریکرد. بەڵام لەلایەکی تریشەوە هەندێکی تر لەو موسڵمانە دڵسۆزانە چەند تێبینی و رەخنەیەکیان خستە ڕوو کە ئەمەش هانی منی‌دا کە زیاتر گرنگی پێبدەم و پیایدا بچمەوە، لەوانە هەندێ ذیکری فەرموودەی لاوازی تێدابوو نەرم هێناو هەندێکی ترم بۆ زیاد کرد لەفەرموودەی چەسپاوو صەحیح کە لەچاپی یەکەم دا نەبوو.

پاشان هەستام بەزیادە ڕوون کردنەوەی ذیکرەکان و وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی کوردی و داڕشتنەوەی بەشێوەیەکی ڕێك‌وپێك تا

موسڵمانان ئاگاداربن بەماناو مەبەستی ئەو ذیکرانەی کەدەیڵێن کەئەمەش زۆر پێویستە. وە هەروەها دانانی سەرچاوەی ئەو فەرموودانە لەپەراوێزی خوارەوەدا بۆ زیاتر متمانە بوون بەراستێتی فەرموودەکە. چونکە پێویستە موسڵمانان هەردەم چاوپۆشن بن بەراستیو ناراستی ئەو ذیکرانەی کە دەیڵێن.

وە هەوڵم داوە ذیکرەکان بەپێی پلەپلەیی ژیانو هەڵسوکەوتەکان دابنێمو دیارە ئەمەش زۆر وردەکاری پێویستە.

پاشان جگە لە ذیکرەکانیش چەند سوننەتو ئادابێکی ئیسلامیم بۆ زیاد کردووە بۆ زیاتر سوود وەرگرتن لێی.

ئاشکراشە هیچ کارێکی مرۆڤ بێ تانەو کەموکورتی نییەو هەر هەڵەیەکیشی تێدابێت داوای لێخۆش بوون دەکەم لەخوا لێی.

وە هەر چاکەیەك و تەواوییەکی پێوە دیاربێ لەخوای گەورەوەیەو هەر هەڵەیەکم کردبێ لە شەیطان و نەفسەوەیە. شادمانیش دەبم بە ناردنی هەر ڕەخنەو پێشنیارێك لەسەری، تا بەهەموو لایەك خزمەتێکی ئەم بوارەی تری ئیسلام بکەین.

لەخوای گەورە داواکارم یارمەتی دەرمان بێت بۆ هەموو کارێکی چاکە و نیەتمان لە ژەنگو ژاڵ پاك بکاتەوەو پەنا دەگرم بەخوا لەوەی کە ئەم کارەم بۆ مەبەستێکی تری جگە لە ڕەزای ئەو کردبێت. داواکاریشم لەدوعای خێر بێبەشم مەکەنو خوای گەورە ئەم کارەم بخاتە سەر تەرازووی چاکە کەمەکانم لەڕۆژی دواییدا.

حەمزە بەرزنجی

١٤٢٠ کۆچی - ٢٠٠٠ زاینی

## بەشی یەکەم:

# ناوە جوانە تەواوەکانی خوای گەورە

﴿وَلِلَّهِ الأَسْمَاءُ الْحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ [الأعراف: ١٨٠]

واتە: بۆ خوای گەورەیە جوانترینی ناوەکان. جابەو ناوانە لێی بپاڕێنەوەو واز لەوکەسانە بهێنن کە لە ڕاستێتی ناوەکانی لادەدەن و هاوبەشی بۆ پەیدادەکەن و ناوی تری لێ دادەتاشن. بەسزای کردەوەی خۆیان دەگەن [1].

وە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: «إنَّ لله تسعةً وتسعين اسماً من أحصاها دخل الجنة» [2]. وفي رواية: «إنَّ لله تسعةً وتسعين اسماً مائةً إلا واحداً لا يحفظها أحدٌ إلاّ دخل الجنة، وهو وترٌ يحب الوتر».

واتە: خوای گەورە نەوەدو نۆ ناوی هەیە لە سەد یەکی کەمە، هەر کەسێ لەبەری بکات [ کە ئەمە وتەی بوخاریو زۆربەی زانایانە، وە ووتراوە ماناکەی بزانێو بەپێی هەبێ، وە وتراوە تا ئەتوانێ خۆی بەماناکەی بڕازێنێتەوە ] دەچێتە بەهەشتەوە.وە خوای گەورە تاکەو تاکی پێخۆشە.

---

(1) تفسير ابن كثير ٢/٤٤٢.

(2) أخرجه البخاري: كتاب الدعوات(٦٤١٠) ومسلم: كتاب الذكر والدعاء (٢٦٧٧).

بەڵام زاناكان دەفەرموون خوای گەورە هەر ئەم نەوەدو نۆ ناوەی نییە و بەس، بەڵكو زیاد لە(١٥٠) ناویان هێناوە لە قورئان و سوننەتدا، وە زیادەی دوای فەرموودەكە كە ناوەكانی هێناوەو ژماردوویەتی‌و ئیمامی ترمذی ڕیوایەتی كردووە لە ئەبی هورەیرەوە ضەعیفە وەك الحافظ دەفەرموێت لە (الفتح)دا(٢١٥/١١)، وە ئیبن تەیمیە لە (مجموع الفتاوى)(٢٧٩،٢٨٢/٦) باسی ئەوە دەكات كە ئەو زیادەیە ووتەی پێغەمبەر (ﷺ)نییە بە هاودەنگی شارەزایان بە فەرموودەكە، بەڵكو ئیمامی ترمذی لە هەندێ شێخی شامییەوە باسی كردووە.



# نەوەدو نۆ ناو لە ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە

**الله:** ناوی تاك و پیرۆزی خوایە. کۆکەرەوەی ناو و سیفەتەکانی‌یەتی. واتە پەرستراوی بە حەق.

**الأول:** یەکەمین. پێش هەمووشت هەبووە.

**الآخر:** دوایەمین. پاش هەموو شت دەمێنێ.

**الظاهر:** دیارو ئاشکرایە بۆ خاوەن ژیری‌یەکان بە هۆی بەڵگەکانەوە. دەستەڵاتدار بەزانستی بەسەر هەموو شتێك دا.

**الباطن:** پەنهان‌و شاراوەیە لە چاوی بەندەکان و زانایە بە ئاشکراو پەنهانەکان، نزیکە بە زانست و توانای.

**العلي:** بەرزی بەدەستەڵات.

**الأعلى:** بڵندە بە هەموو روویەك بە زات و سیفات و قەهری. بڵند بۆتەوە لەسەر عەرشەکەی.

**المتعال:** بەرز بەسەر دروستکراوانی‌یەوە. وە خۆپاککەر لە سیفاتی دروستکراوان.

**العظيم:** مەزنایەتی‌و خاوەنی شکۆو دەستەڵات و توانای بێ‌کۆتا. وە لە هەموو گەورەیەك گەورەتر.

**المجيد:** پایەبەرزی تەواو. رێزدارو چاکەکار.

**الكبير:** گەورەی بێ‌کۆتا لە گەورەیی‌داو هەموو شتێك جگە لەو بچوکە.

السميع: بیسەری وەڵامگۆی بێ سنوور بە هەموو شتێك.
البصیر: بینەری بێ سنوور بە ئاشكراو پەنهان و شارەزا.
العلیم: زانایە بەبێ فێركردن بە هەموو دروست كراوان و نهێنییەكانیان وە زانایە بە چیەو ئاشكرا.
الخبیر: شارەزا بە وورددكاری شتەكان لەسەر حەقیقەتی خۆی.
الحمید: سوپاس كراوو كاربەجێ لە كرداریدا. شایستەی ستایشە لە خۆشیو ناخۆشیدا.
العزیز: زاڵ. هەرگیز ناشكێ. دەسەڵاتداری بەهێزی بێ وینە.
القدیر: بە توانای بێسنوور
القادر: بە توانایە بەسەر هەموو شتێكداو هیچ ماندووی ناكات.
المقتدر: بەتوانای تەواوەو هیچ شتێكی لێ عاسی نابێت.
القوی: بەتوانا بەسەر هەموو توانایەك دلو هەرگیز بێ دەستەڵاتی رووی تێ ناكات
المتین: بەهێزی بێنیاز بەهاوتاو بێ كۆتا.
الغنی: دەوڵەمەندی بێپێویستی بە بەندەكانی، بەڵكو دروستكراوان موحتاجی ئەون.
الحكیم: كاربەجێی لێزان. بێ هەڵە لە كارەكانیدا.
الحلیم: هێدی. ئارامو پاش خەری سزاو بێ پەلەیە، رۆژی دەری سەرپێچییكەرە.
العفو: لێبووردە لە گوناه.

الغفور: ئەبەخشێ بوو. گوناه پۆش.
الغفار: ئەبوبوردەی تەنیاو پۆشەری عەیبە. هەرکات تەوبە بکرێت لە گوناه دەبوورێت.
التواب: تەوبە وەرگری بەندەکانی کاتێ تەوبە دەکەن.
الرقیب: چاودێر بە بەندەکانی و زاناو ئاگادارە بە کارو کردەوەیان.
الشهید: ئاگادار. هیچی لێ وون نابێ و ئاگاداری بەندەکانێتی چی ئەنجام دەدەن.
الحفیظ: پارێزەری زەوی و ئاسمانەکان و بەندەکانی. وە ئاگاداری کردارو ووتەو نیەتی بەندەکانێتی.
اللطیف: نەرمو چاکەکار لەگەڵ دروست کراوان لەگەڵ بەندەکانی و ڕۆزی دەریان.
القریب: نزیکە بە زانستی، وە نزیکە لەو کەسانەی ئەێ دەپارێنەوە بە وەڵامدانەوەیان.
المجیب: وەڵامگۆ. وەڵامی پارانەوە دەداتەوە بە بەخشین. وە وەڵامی ئاچارو پەڕێکەیراو دەداتەوە بە دەرو لێ کردنەوەیان.
الودود: خۆش ویستراو لەدڵی دۆستەکانیدا. وە بەندە صالحەکانی خۆش دەوێت و ئەێیان ڕازی دەبێت و کردەوەیان قبوڵ دەکات.

الشاكر: سوپاسی کردنەوەی کەم دەکات و رازی دەبێت لێی و وەری دەگرێت و پاداشتی دەداتەوەو لە گوناهی زۆر خۆش دەبێت.

الشكور: سوپاسی چاکەی کەم دەکات و پاداشتی زۆری دەداتەوەو نیعمەتی زۆر دەبەخشێ و بە شوکری کەم رازییە.

السيد: سەروەرو گەورەو خاوەنی سەروەری رەها. خاوەنی هەموو شتە.

الصمد: جێی مەبەست و جێی نیازە لە هەموو پێویستییەکدا. وەپێویستی بەکەس نییە.وە سیفات تەواوەو کەس لەسەرو ئەوەوە نییەو سەرداری نییە.

القاهر: بەتواناو دەستەڵاتدار بەسەر هەموو شتێک دا.

القهار: سزادەرو زەبونکەری بێ بەروالو هاوبەش پەیداکەران بەتوانای خۆی.

الجبار: خاوەن دەستەڵاتی ناچارکار.

الحسيب: ئەوەندە دەبەخشێت کە بەسیان بێت، لێپرسەرەوەو جێی راز بۆ بەندەکان و بۆیان بەسە.

الهادي: رێ پیشاندەری کەسانێک کە بیەوێت بۆ رێگای راست. رێنموییکاری دروستکراوان بۆ بەرژەوەندییەکانیان.

الحكم: فەرمانڕەوای دادوەر. حوکمڕان لە نێوان هەق و بەتاڵ.

القُدُّوس: پیرۆزو پاك لەهەموو عەیب و ناتەواوییەك لە سیفەتەكانیداو ئەو خوایەی كە تەسەور ناكرێت.

السَّلام: بێعەیب. دڵنیاكەری ئەو كەسانەی كە شایستەی سزا نین.

البَّر: چاكەكاری بەبەزەیی لەگەڵ دروست كراوەكانیدا.

الوَهّاب: بەخشەری بێ داوای پاداشت و بەخشەری تەوفیق و چەسپان لەسەر دین.

الرَّحمن: بەبەزەیی. بەزەییەكەی هەموو شتێكی گرتۆتەوە .

الرَّحیم: بەخشندە. بەرامبەر بەو كەسانەی كە ویستی لێیەتی لە ئیمانداران.

الكَّریم: بەرێزی نیعمەت بەخش بە بەندەكانیو بێ هەڵەو ناتەواوی.

الاكَرم: ڕێزگری دۆست و هەڵبژێر دراوەكانیەتی و بەخشەرە بەبێ بەرانبەر.

الرَّؤوف: زۆر میهرەبان بەرانبەر بەگوناهباران.

الفَتَّاح: ڕوونكەرەوەی هەق و بەتاڵ و فەوتێنەری بەتاڵ. وە داوەری نێوان بەندەكان بە هەق، دەروكەرەوەی دەرگاكانی ڕەحمەت و ڕۆزیو كارەكان و سەرخەری ئیماندارن و ستەم لێكراوان.

الرَّازِق: ڕۆزی دەری هەموو زیندەوەران .

الرَّزَّاقُ: دروستكراوانی دروست كردووەو رۆزی پێ گەیاندوون. رۆزی دانی هەموو دروستكراوانی گرتووەتەوەو كەسیانی تایبەت نەكردووە پێی لە گوێ رایەڵانی.

الحَيُّ: زیندووی بێ سەرەتاو كۆتایی و ئەزەلی.

القَيُّــــوم: هەڵســـوڕێنەری بوونـــەوەرو كـــارو كـــرداروو بێ ئیحتیاج بەكەس و هـەموو كەسێك هـەژارو موحتـاجی ئەوە.

الرَّبُّ: پەروەردگاری بێ وێنـە. دروست كەرو خاوەنی دروست كـــردن و فـــەرمان كـــردن، هەڵـــسووڕێنەری كـــارو بوونەوەروپەروەردگاری سەرجەم بەندەكانی.

المَلِكُ: پادشـاو خـاوەن مـوڵكی تـەواوو دەسـت رۆیـشتوو لـە موڵكەكەیدا.

المَلِيكُ: موڵك بەدەستی دروست كراوەكان.

الواحدُ: یەك و تەنیا، تەنیایە لە زاتیدا.

الأحَـدُ: تـاك. تـەنیای بێهـەوجێ بەكـەس. تەنیایـە لـە زات و سیفاتیدا.

المُتكَبِّرُ: خۆبەگەورەزان. خۆبەگەورەگر لە خراپەو ستەم، گەورە لەسیفاتی دروست كراوان و تەنیا لەگەورەییدا.

الخَـالقُ: دروسـت كـەری دروسـتكراوانی و داهێنـەریان لەسـەر شێوازێك كە پێشتر وێنەی نەبووە.

الخَلاَق: بەدیهێنەری کاربەجێ.

الباريء: بەدیهێنەری جوانکار.

المصوَر: وێنەکێش، وێنەکێشەری هەموو دروست کراوان هەریەکەو لەسەر شێوەیەك.

المؤمن: دڵنیاکەری دۆستەکانی لە سزاو بەخشەری ئەمین بوون لە ترس و خەفەت بە بەندەکانی. وە بەڕاست داشەری بەڵێنەکەی بۆ بەندەکانی.

المهيمن: ئاگادارو پارێزەی شتەکان. چاودێری پارێزەر بە ووتەی کرداری دروستکراوانی.

المحيط: تواناو زانستی دەوری هەموو شتێکی داوە.

المقيت: بژێوکەێن و بەخشەری ڕزق و ڕۆزی‌یان. دەستەلاّتدار

الوكيل: کار پێسپێردراو. پشت و پەنا.

الكافي: بەس. بۆ بەندە ئیماندارەکانی بەسە ئەگەر بیکەنە پشت و پەنا.

الواسع: فراوان. ڕۆزی دانی هەموو دروست کراوانی گرتۆتەوەو بەزەیی‌یەکەی هەموو شتێکی داپۆشیوە.

الحقّ: پایەدار. ڕاست و ڕەواو هەق بە بوونی.

الجميل: جوانی بێسنوور لە زات و سیفات دا.

الرَّفِيق: نەرم و بە بەزەیی‌یە بە بەندەکانی‌و ئاسانی دەوێت بۆیان و گرانی ناوێت و لەسەرو توانایانەوە تەکلیفیان لێ ناکات، بەڵکو دەیانبەخشێ‌و نەرمە لەگەڵیان.

الحَيِي: بەشەرم بەجۆرێك هاوتای ئێمەو لەهیچ شتێك ناچێ.

السِّتِير: داپۆشەری عەیب‌و گوناه.

الإله: پەرستراوی هەق.

القابض: ڕۆزی ئەگرەوە. وێك هێنەر.

الباسط: ڕۆزی بۆ فراوانکەر. لەدووبەر.

المُعطي: بەخشەر. هەموو شتێکی چاکی بەخشیوەو ڕاویەتی.

المُقَدِّم: پێشخەری دانەر لەشوێنی خۆی‌داو پێشخەری سزا بۆ کەسێك شایستەی بێت بە حیکمەتی خۆی.

المُؤَخِّر: دواخەری دانەر لە شوێنی خۆی‌داو دواخەری سزا بۆ کەسێك شایستەی بێت بە حیکمەتی خۆی.

المُبِين: ڕۆشن کەرەوە. ڕوون کەرەوەی زاتی خۆی کەبێ هاوەڵە. یان ڕۆشنکەرەوەی ڕێگای چاکەو کرداری وە ئەو کردەوانەی هۆکاری سزای ئەون.

المَنَّان: خاوەنی منەت‌و فەزڵ‌و بەخشین، شایستەی منەت کردنە.

الـوَلي: یاریدەدەری گوێ ڕایەڵی کەرانی‌و سەرخەری بەندە ئیماندارەکانی‌و سەرپەرشتی کاریان و لە ڕۆژی دوایی‌دا خۆی پاداشت و سزایان دەداتەوە.

المَولى: پشت و پەناو سەرپەرشتی کاری ئیمانداران.

النَّصير: سەرخەری بڕواداران.

الشَّافي: شیفادەری دەردەکان تەنها ئەوە.

مالِكُ المُلك: خاوەنی موڵك. چۆن بیەوێ دەیگۆڕێ.

جامِعُ النَّاس: کۆکەرەوەی خەڵکی لە ڕۆژی دواییدا.

نُورُ السَّموات والأرض: بە نووری خۆی کوێران چاو ڕۆشن دەکات و بە هیدایەتی خۆی سەرگەردان ڕێنمووییی دەکات، نوورو ڕۆشنکەرو ڕووناکی ئاسمانەکانو زەوییە بە هۆی بەڵگەکانییەوە.

ذو الجَلالِ والإكرام: شایستەی شکۆو ڕێز، خاوەنی دەستەڵاتو بەخشندە.

بَديعُ السَّمواتِ والأرض: داهێنەری ئاسمانەکانو زەوی.[٢]

(٢) بڕوانە ئەم ناوانە لەگەڵ بەڵگەکانیان لەقورئانو سوننەتدا لە کتێبی (شرح الأسماء الحسنى في ضوء الكتاب والسنة)ی سعيد بن علي بن وهف القحطاني، وە بڕوانە (معالم التوحيد)ی د.مروان ابراهيم القيسي. المكتب الاسلامي.

## بەشی دووەم:

# چەند تێبینیەك

ذیکـر بریتیە لـە دەربڕینـی چـەند وشـەیەك بـە دەم یـان لـەدەروون دا بـەو شـێوەیەی کـە خـوای گـەورە پاشـان پێغەمبەرەکەی (ﷺ) پێیان پێداوەو تیایدا بە گەورە زانین و پاك ڕاگرتن و ستایش کردن و یادکردنی پەروەردگاری تێدایە. وە بەندە لەسەری پاداشت وەردەگرێتەوەو تای تەرازووی چاکەکانی پێدەوڵەمەندو قورس دەکات. وە بەهۆیەوە لە دنیاشدا دەپارێزێ لە شەیطانو خراپە.

برای خۆم. بزانە کە قورئان ذیکرە و گەورەترین ذیکرە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَمَنْ أعرضَ عن ذكري فإنّ له معيشةً ضنكًا و نحشُرهُ يومَ القيامةِ أعمى ﴾. (طه: ١٢٤)

واتە: هەرکەسێك پشت هەڵبکات لەم ذیکرەی من کە قورئانە ئەوا ژیانێکی ناسۆری دنیاو ناو گۆڕی بۆ هەیەو لە ڕۆژی دواییدا بە کوێری حەشری دەکەین.[1]

وە نوێژ کردن ذیکرە: ﴿ يا أيُّها الذين آمنوا إذا نودي للصّلاة من يوم الجُمُعَةِ فاسعَوا إلى ذكر الله وذروا البَيع.. ﴾.(الجمعة ٩)

(١)مختصر تفسير ابن كثير(٣/١٩٤-١٩٥).

واته: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە کاتێك بانگ درا بۆ نوێژی ڕۆژی هەینی ئەوا بە گرنگی پێدانەوە بچن بەرەو ذیکری خواو دەست لە مامەڵەو کڕین و فرۆشتن هەڵگرن. (*)

هەروەها پاڕانەوەو صلاوات دان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) ذیکرەو فێرکردنی خەڵکی لە زانستی شەرعی ئیکرەو زۆربەی مەڵس و کەوتەکانی تری ڕۆژانەش ذیکری تایبەتی هەیە.

١- هەموو ذیکرێك تەواو نییە تا بە زوبان نەوترێت و دەرنەبڕدرێت بەجۆرێك خۆی بۆبیستن ئەگەر بیستنی تەواو بوو.

٢- یادکردن (ذکری) خوای گەورە بەدڵ و زوبان چاکترە لە یادکردنی خوا تەنها بەدڵ، وە یادکردنی خوا تەنها بەدڵ چاکترە لە یادکردنی خوا تەنها بە زوبان، وە پێویستە کەسی ذیکرکەر مانای ئەو ذیکرانە بزانێ‌و دالغەی لەلای بێ.

٣- زۆر جار چاك وایە لەکاتی ئیکرکردن‌دا بیپچرێنێت‌و دوایی بچێتەوە سەری لەبەر چەند هۆیەکی گرنگ. وەکو وەڵام دانەوەی سلاوکەرێك یان یەکێك پژمەی‌و وتی (الحمد لله) پێویستە وەلأمی بداتەوە بە (يَرحَمُكَ الله) یان وەڵام دانەوەی تەلەفۆن...

٤- لەش گران‌و نافرەتی بێنوێژو زەیستان (الحائضة والنفساء) دەتوانی بەدڵ‌و زوبان ذیکر بخوێنێ‌و جائیزە وەکو تەسبیحات‌و پاڕانەوە....

---

(*) مختصر تفسير ابن كثير(٣/٤٩٦-٤٩٧).

٥- خوێندنی قورئان ئەگەر ئایەتێك یان چەند ئایەتێك بێت دروست نی‌یە لەسەر لەش گران و ئافرەتی بێنوێژو زەیستان. بەڵام ئەگەر ذیکرێکی دەخوێندو لە ذیکرەکەدا ئایەتێك یان زیاتری تێدابوو ئەوە دروستە بەمەرجێ مەبەستی سوننەتەکە بێت.

٦- ذیکرکردن لە هەموو کاتێکدا چاکەو جائیزە تەنها لەچەند کاتێکی شازدا نەبێت، وەکو کاتی سەرئاوکردن یان کاتی جیماع یان کاتی گوێگرتن لە ووتاری هەینی یان کاتی خەواڵوویی.

٧- ئەگەر دەمت پاك نەبوو ئەوا بەئاو پاکی بکەرەوە. وە ئەگەر تامی گۆڕابوو ئەوا بەسیواك پاکی بکەرەوەو ئینجا ذیکر بخوێنە، چونکە ذیکرکردن یان قورئان خوێندن بەدەمی ناخاوێنەوە مەکروهە بەڵام حەرام نی‌یە، وە لە شوێنێکی پاك و بە دەست نوێژەوەو بەشێوەیەکی خشوع دانیشە ئەگەر کرا .

٨- ذیکری خوا لە هەموو حاڵەتێکی ئەشداو بەهەموو شێوەیەك جائیزە. ئەگەر بەوەستانەوە بێت یان دانیشتن یان ڕاکشاوی یان بەڕێگاوەو بەڕۆیشتن یان بەسواری، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ الَّـــذِينَ يَـــذْكُرُونَ اللهَ قِيَامـــاً وَقُعُـــوداً وَعَلَـــى جُنُـــوبِهِم...﴾.
(آل عمران: ١٩١)

واتە: ئەو ئیمانداره ژیرو تێگەیشتووانەی کە یادی خوا دەکەن بە پێوەو لە کاتی دانیشتن و لە کاتێکدا لەسەرلاو ئەنیشت کەوتوون.[٦]

٩- ئەگەر بۆ کاتێك یان شوێنێکی دیاری کراو چەند نیکرێك هاتبوو لە فەرموودەی صەحیح دا: ئەوا چاك وایە هەرجارەو یەکێکیان بووترێ، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) وای کردووە. وە چاك وایە خوو نەگرین بە دانەیەکیانەوە. تا لە خێرو پاداشتی هەموویان بێبەش نەبین.



(٦) مختصر تفسير ابن كثير(٣٤٦/١).

## بەشی سێیەم:

# پاڕانەوە (الدُّعاء)

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ادعوني أستَجِبْ لَكُم. إنَّ الَّذِينَ يَستَكبِرونَ عَنْ عِبادَتي سَيَدخلونَ جَهَنَّمَ داخِرِينَ ﴾.(الغافر:٦٠)

واتە: خوای پەروەردگارتان فەرمانتان پێدەکات بە پاڕانەوەو بەڵێنی داونەتێ بە وەڵام دانەوەی. ئەوانەی لە پەرستش و پاڕانەوە لێم و یەکتاپەرستی من یاخین ئەچنە دۆزەخەوە بە بێڕێزیو سووکیو ڕیسوایی.[٧]

وە دەفەرموێت: ﴿ و إذا سألَكَ عِبادي عَنّي فإني قَرِيبٌ أُجيبُ دَعوةَ الدّاعِ إذا دَعانِ فَليَستَجيبوا لي وَلْيُؤمِنوا بي لَعَلَّهُم يَرشُدونَ﴾.(البقرة:١٨٦)

واتە: ئەگەر بەندەکانم پرسیاریان لێکردی لە بارەی منەوە ئەوە من نزیکم، وەڵامی داواکەر دەدەمەوە ئەگەر داوا بکات، دەبا وەڵامی فەرمانەکانی من بدەنەوەو باوەڕم پێبێنن بەڵکو سەرفرازبین.[٨]

پێغەمبەریش(ﷺ) دەفەرموێت: « الدُّعاءُ هُو العِبادةُ وقال رَبُّكُمُ ﴿ ادعوني أستَجِبْ لَكُم ﴾ »[٩]

---

(٧) مختصر تفسير ابن كثير ٢٤٩/٣
(٨) مختصر تفسير ابن كثير ١٦٤/١.
(٩) أبو داود ٧٨/٢ والترمذي ٢١١/٥ و ابن ماجه ١٢٥٨/٢ و بروانە صحيح الجامع الصغير ١٥٠/٢ وصحيح ابن ماجه ٣٢٤/٢.

واته: پاڕانەوە پەرستشە. پەروەردگارتان دەفەرموێ: لێم بپاڕێنەوە وەڵامتان دەدەمەوە.

وە دەفەرموێت (ﷺ) «إنّ ربّكم تبارك وتعالى حيّيٌ كريمٌ يستحي من عبدِهِ إذا رفعَ يديهِ إليهِ أن يردَّهُما صِفراً».[10]

واتە: پەروەردگاری پاك و بەرزی ئێوە بەشەرم بەرێزە شەرمی لێ دێت کاتێك بەندەیەکی هەربوو دەستی بۆ بەرزیکاتەوە و بپاڕێتەوە کە بەبێ ئومێدی و بە بەتاڵی بگەڕێنێتەوە.

وە دەفەرموێت (ﷺ): «ما مِنْ مُسلمٍ يدعُو اللهَ بدعوةٍ ليسَ فيها إثمٌ ولا قطيعةُ رَحِمٍ إلاّ أعطاهُ اللهُ بها إحدى ثلاثٍ: إمّا أنْ تعجّلَ لهُ دعوتُهُ، وإمّا أنْ يدّخرها لهُ في الآخرةِ، وإمّا أنْ يصرفَ عنهُ مِنَ السُّوءِ مثلَها. قالوا: إذاً نُكثِرَ. قالَ: اللهُ أكثرُ».[11]

واتە: هیچ موسڵمانێك نییە کە بپاڕێتەوە لەخوای گەورە بەدواکارییەك کەتاوان و بڕی بەزمیی نەبێت ئیلا خوای گەورە یەکێك لەم سێ شتەی دەدلتێ:

١- یان پاڕانەوەکەی بۆ پێش دەخات و گیرا دەبێت.

٢- یان بۆی هەڵدەگرێ بۆ پاداشتی قیامەت.

٣- یان بەئەندازەی پاڕانەوەکەی خراپەو بەڵای لێدوور دەخاتەوە.

وتیان: کەواتە زۆر دەپاڕێینەوە. ئەویش فەرمووی: خوای گەورە زۆرتر پاداشتتان پێدەبەخشێ.

---

(10) اخرجه ابوداود ٢/٧٨ والترمذي ٥/٥٥٢ وابن ماجه ٢/١٢٧١ وقال ابن حجر: سنده جيد. وە بڕوانە صحيح الترمذي ٣/١٧٩.

(11) الترمذي ٥/٥٦٦ و ٥/٤٦٢ واحمد ٣/١٨ وانظر صحيح الجامع ٥/١١٦ وصحيح الترمذي ٣/١٤٠.

## لە ئادابەکانی پاڕانەوەو هۆکانی وەڵام دانەوەی(١٢)

١- دڵسۆزی(الإخلاص) بۆ خوای گەورە.
٢- دەبێ بەسوپاس و ستایشی خوای گەورەو صەڵوات دان لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) دەست پێ بکات.
٣- جەزم کردن لەپاڕانەوەو بڕوابوون بەوەڵام دانەوەی.
٤- سووربوون و دووبارەکردنەوە(الحاح) لەپاڕانەوەداو پەلەنەکردن. واتە نەڵێت پاڕامەوەو گیرا نەبوو.
٥- ئامادەبونی دڵ لەکاتی پاڕانەوەدا.
٦- پاڕانەوە لە کاتی خۆشی و ناخۆشی و تەنگاوی و پێ‌گیراندا.
٧- جگە لەخوای گەورە لە کەس نەپاڕێتەوە.
٨- نەپاڕانەوە لەکەس و کارو سامان و منداڵ و خۆت بەخراپە.
٩- دەنگ نزم کردنەوە لەکاتی پاڕانەوەدا لە نێوان پەنهان و ئاشکرادا.
١٠- دان نان بەتاوان و داواکردنی لێخۆش بوون لەخوا لێی و دان نان بەنیعمەت و سوپاس کردنی خوای گەورە لەسەری.
١١- زۆر لەخۆنەکردن لەرێکخستنی سەروا لە پاڕانەوەدا(عَدَم تَکلّف السّجع).
١٢- کڕوزانەوەو خشوع و ئومێدو ترسان لەخوای گەورە.
١٣- گەڕاندنەوەی مافی ستەم لێکراوان لەگەڵ تەوبەدا.
١٤- سێ‌بارە کردنەوەی پاڕانەوەکە.

(١٢) بڕوانە ئەم ئاداب و هۆکانی وەڵام دانەوانە لەگەڵ بەڵگەکانیاندا لە(الذکر و العلاج من الکتاب و السنة) لاپەڕە ٨٨-١٢١.

١٥- ڕووكردنە ڕووگە ( القِبْلة ).
١٦- دەست بەرزكردنەوە لە پاڕانەوەدا.[١٣]

---

(١٣) بۆ شێوازەكانی دەست بەرز كردنەوە لەپاڕانەوەدا:

عن ابن عباس( رضي الله عنهما ) أن النبي (ﷺ) قال: ( المسألة أن ترفع يديك حذو منكبيك أو نحوهما، و الإستغفار أن تشير بأصبع واحدة، و الابتهال أن تمد يديك جميعاً ). حديث صحيح اخرجهُ ابوداود(١٤٨٩-١٤٩١) مرفوعاً و موقوفاً.

واتە: بۆ داواكردن و پاڕانەوەی شتێك لە خواكە، یان دوور بوون لە خراپەیەك هەردوو دەستت تا ئاستی شانەكانت یان نزیكی بەرز دەكەیتەوە، وە بۆ داوای لێخۆشبوون كردن لە خوای گەورە بە یەك پەنجە( كە پەنجەی شایەتمانە) ئاماژە دەكەیت، وە بۆ كاتی زۆر ناڕەحەتی و سەغڵەتی و پەرێشانی هەردوو دەستت درێژ دەكەیت

تێبینی:

(ابن باز)(ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێت) دەفەرموێت: (دەست بەرزكردنەوە لەپاڕانەوەدا سوننەتە یەكێكە لەهۆكانی گیرابوون و وەڵام دانەوەی.. بەڵام سوننەت نییە كەدەست بەرز بكرێتەوە لەو شوێنانەدا كەلەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) بەرز نەكراوەتەوە، وەكو دوعای دوای نوێژە فەرزەكان و نێوان هەردوو كوڕنوشەكەو پێش سڵاودانەوەی نوێژو كاتی ووتاردانی ڕۆژی هەینی و جەژنەكان چونكە پێغەمبەر(ﷺ) لەو كاتەدا دەستی بەرزنەكردۆتەوە. بەڵام ئەگەر دوعای باران بارین (الاستسقاء) ی كرد لەخوا لەووتاری ڕۆژی هەینی یان دوو جەژنەكەدا ئەوا ئەتوانێ دەست بەرز بكاتەوە هەروەك پێغەمبەر(ﷺ) كردویەتی. بەڵام بۆ نوێژی سوننەت ئەوا هیچ ڕێگرێك نازانم لەبەرزكردنەوەی دەست لەپاڕانەوەی دوای نوێژەكەدا. بەبەڵگەی كاركردن بەهەموو دەلیلەكان. بەڵام باشتر وایە بەردەوام نەبێت لەسەر ئەمە. چونكە ئەمە لەپێغەمبەرەوە(ﷺ) نەهاتووە كە كردبێتی. خۆ ئەگەر بیكردایە لەدوای هەموو نوێژە سوننەتەكانەوە ئەوا هاوەڵان بۆیان نقڵ دەكردین چونكە هاوەڵان هەموو ووتارو كردەوەكانی پێغەمبەریان(ﷺ) لەسەفەرو مانەوەی و لەهەموو كاتەكانیدا بۆ گێڕاینەوین. خوای گەورە لەهەموویان ڕازیبێت). بڕوانە كتێبی (فتاوى مهمة تتعلق بالصلاة) لاپەڕە ٤٧ . ٤٩..

١٧- دەست نوێژ شتن پێش پاڕانەوە ئەگەر گونجا.

١٨- سنوور نەشکاندن لە پاڕانەوەدا ( واتە نەپاڕانەوە بە شتی ستەم وەحاڵ وەنگیبەرز یان قوڵکردنەوەی مەسەلەیەك)

١٩- دەبێ دوعاکەر لە پێشدا بپاڕێتەوە بۆ خۆی پاشان ئەگەر ویستی بۆ غەیری خۆی بپاڕێتەوە.[١٤]

٢٠- دەبێ تەوەسول بکات بۆ لای خوا بەناوە جوانەکانی و سیفەتە بەرزەکانی یان بەکردەوەیەکی چاك کەدوعاکەر خۆی ئەنجامی دابێت یان بە پاڕانەوەی پیاوچاکێکی زیندووی ئامادە کەبۆی بکات.

٢١- دەبێ خواردن و خواردنەوەو پۆشاکی حەڵاڵ بێت.

٢٢- نابێ بپاڕێتەوە بەتاوان یان بێبەزەیی.

٢٣- دەبێ فەرمان بکات بەچاکەو بەرگری بکات لەخراپە.

٢٤- دوورکەوتنەوە لەهەموو جۆرە یاخیبوونێکی خوای گەورە.

---

(١٤) چەسپاوە لەپێغەمبەرەوە ﷺ کەسەرەتا بەخۆی دەستی بەپاڕانەوە کردووە. وەهەروەها چەسپاویشە کەبەخۆی دەستی پێنەکردووە وەکو پاڕانەوەی بۆ: (انس وابن عباس وام اسماعیل و غەیری ئەوان) وەبەوانە درێژەی ئەم مەسەلەیە لەشەرحی ئەوەوویدا بۆ ( صحیح مسلم ) (١٥/١٤٤) وە(تحفة الاحوذي) شەرحی (سنن الترمذي) ٩/٣٢٨ والبخاري مع الفتح ١/٢١٨

# چەند کات و شێوازو شوێنێك

# کە پاڕانەوەی تیادا وەڵام دەدرێتەوە (١٥)

١- شەوی قەدر.

٢- کۆتایی نیوەشەو.

٣- لەپاش هەموو نوێژە فەرزەکانەوە.(١٦)

٤- لەنێوان بانگ و قامەتدا.

٥- کاتێك لەهەموو شەوێکدایە.

٦- لەکاتی بانگ دان بۆ نوێژە فەرزەکان.

٧- لەکاتی باران باریندا.

٨- لەکاتی تێك ڕژانی سوپاکان لەپێناوی خوادا.

---

(١٥) بڕوانە ئەم کات و شێوازو شوێنانە لەگەڵ بەڵگەکانیان بەدرێژی لە(الذكر و الدعاء و العلاج بالرقى من الكتاب والسنة) لاپەڕە ١٠١ ، ١١٨

(١٦)ابن تەیمیە( ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئاماژە بەوە دەکات کەوا پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی کرد بەمعاذ کە لە پاش هەموو نوێژەکانەوە بڵێ: (اللهمَّ أعنّي على ذكرك وشكرك وحسن عبادتك) وە باسی ئەوە دەکات کە (دُبر الصلاة) واتاو بێش سڵاودانەوەیە نەك دوای تەواو بوونی نوێژەکەش دەگەیەنێ. بەڵام لە پێغەمبەرەوە (ﷺ)نەهاتووە کە لە دوای تەواو بوونی نوێژە فەرزەکانەوە بە کۆمەڵ پاڕابنەوە خۆ ئەگەر بیکردایە دەگەیشت پێمان. بۆ زیاتر شارەزا بوون بڕوانە(مجموع الفتاوى)(١٢/٢،٣،٢٩٣،٢٨٩) کەواتە وا باشە موسڵمان زۆربەی دوعاکانی لە ناو نوێژەکەیدا بێت.

٩- کاتێك لە ڕۆژی هەینی دایە: وە ڕاست ترین ووتە لەمەدا ئەوەیە کە کۆتایی کاتە لەکاتەکانی عەسری ڕۆژی هەینی، وە واردیش بووە کە ئەگونجێ لەو نێوانەدا بێت کە ئیمام لە کاتی ووتاردانندا دادەنیشێ تا نوێژەکە تەواو دەبێ.

١٠- لەکاتی خواردنەوەی ئاوی ( زەمزەم ) لەگەڵ نیەتێکی ڕاست دا. ( لەکاتی ئەخۆشیدا دەخورێتەوە بەلام بۆ دوعاکردن لەم کاتەدا بەڵگەم نەدیوە لەسەری ) م.عبدالکریم.

١١- لە کوڕنوش دا (السجود).

١٢- لەکاتی بەخەبەرهاتن لەشەودلو پاڕانەوە بە سوننەتی (مأثور) ی ئەوکاتەدا.

١٣- ئەگەر لەسەر پاکێتی (دەست نوێژ) خەوت و پاشان لەشەودا بەخەبەرهات و پاڕایەوە.

١٤- لەکاتی پاڕانەوەدا بە« لا اله الا انت سبحانك إني كنت من الظالمين »

١٥- پاڕانەوەی خەڵکی لەپاش مردنی کەسێك.

١٦- پاڕانەوە لەدوای ستایشی خواو صلاوات دان لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) لەتەحیات دا.

١٧- لەکاتی پاڕانەوە لەخوا بەو ناوە گەورەیەی(الإسمَ الأعظم) کە ئەگەر هەرکەسێك پێی بپاڕێتەوە وەلام دەدرێتەوەو ئەگەر داوای پێبکرێ پێی دەبەخشرێ.[١٧]

---

(١٧) بڕوانە ناوە گەورەکەی خوای گەورە لە لاپەڕە(٢٧-٢٨) لەم نامیلکەدایە

١٨- پاڕانەوەی موسڵمان بۆ برا موسڵمانەکەی بەپەنهانی.
١٩- پاڕانەوە لەڕۆژی عەرەفەدا لەعەرەفە.
٢٠- پاڕانەوە لەمانگی ڕەمەزان دا.
٢١- لەکاتی کۆبوونەوەی موسڵماناندا لەکۆڕی ذیکردا.
٢٢- پاڕانەوە لەکاتی بەڵاو موسیبەت دا بەووتنی (( إنا لله وإنا إليه راجعونَ اللهُم اجْرني في مُصيبَتي واخلِف لي خيراً مِنْها )).
٢٣- پاڕانەوە لەکاتی ڕووکردنی دڵ بۆلای خوای گەورەو تاوەندنی دڵسۆزی(الإخلاص).
٢٤- پاڕانەوەی ستەم لێکراو لەو کەسەی ستەمی لێکردووە.
٢٥- پاڕانەوەی باوك لە کوڕەکەی بەچاکەو خراپە.
٢٦- پاڕانەوەی گەشتیار(المسافر).
٢٧- پاڕانەوەی ڕۆژووەوان هەتا بەربانگ دەکاتەوە.
٢٨- پاڕانەوەی ڕۆژووەوان لەکاتی بەربانگ کردنەوەدا.
٢٩- پاڕانەوەی ناچارو لێقەوماوو پێ‌گیراو.
٣٠- پاڕانەوەی پێشەوای دادپەروەر.
٣١- پاڕانەوەی کوڕی چاکەکار لەگەڵ دایك و باوکیدا.
٣٢- پاڕانەوە لەدوای دەست نوێژ ئەگەر پاڕایەوە بە سوننەتی (مأثور) ی ئەوکاتە.
٣٣- پاڕانەوەی دوای ڕەجم کردنی(الجَمرةُ الصُغرى).
٣٤- پاڕانەوەی دوای ڕەجم کردنی(الجَمرةُ الوسطى).

٣٥- پاڕانەوە لەناو کەعبەدا. هەرکەس نوێژی کرد لەناو (الحِجر)دا ئەوا هەر بە(البَیت) حسابە.

٣٦- پاڕانەوە لەسەر (صەفا).

٣٧- پاڕانەوە لەسەر (مەروە).

٣٨- پاڕانەوە لەلای (المشعر الحرام)دا.

وە بێگومان هەردەم لە پەروەردگاری خۆی دەپاڕێتەوە لە هەر شوێنێکدا بێت ﴿ وإذا سألك عبادي عني فإني قريب أجيب دعوة الداع إذا دعان... ﴾، بەڵام ئەم کات و شوێن و شێوازانە پێویستییان[(١٨)] بە چاودێری و گرنگی پێدانی زیاتر هەیە.

## ناوە گەورەکەی خوای پەروەردگار( إسمُ اللهِ الأعظم )

١- «اللهمَّ إني أسألك بأنَّ لك الحمدَ لآ إله إلاَّ أنت (وحدك لا شريك لك) المنَّان (يا) بديع السموات والأرض. يا ذا الجلال والإكرام. يا حيُّ يا قيّوم. إني أسألكَ (الجنة وأعوذ بكَ مِنَ النار)»[(١٩)]

واتە: خوایە من دەپاڕێمەوە و داوات لێدەکەم بەوەی کەسوپاس و ستایش هەر بۆ تۆیە. هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق

---

(١٨) بۆ مەبەستی زیاتر شارەزابوون بڕوانە (الدعاء ويليه العلاج...) ٣ ٦ - ١٧.

(١٩) أبوداود ٢/٨٠ وابن ماجه ٢/١٣٦٨ والنسائي ٣/٥٢ والترمذي ٥/٥٥٠ وە بڕوانە صحيح النسائي ١/٢٧٩.

جگە لەتۆ، تەنهای بێهاوەڵی، خاوەنی فەزڵو منەتی. ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەوی. ئەی خاوەن پایەی بەرزو ڕێز. ئەی زیندووی مشوورگێڕی هەڵسوڕێنەری بوونەوەر. من داوای بەهەشتت لێدەکەمو پەنات پێدەگرم لەئاگری دۆزەخ.

٢- « اللهُمَّ إِنّي أسألكَ بأنّي أشْهَدُ أنَّكَ أنتَ اللهُ لا إلـه إلاّ أنـت الأحَدُ الصَّمَدُ. الّذي لَمْ يَلِدْ ولَمْ يُولَـد. ولَـمْ يكُـنْ لَـهُ كُفُـوًا أحدٌ ».[٢٠]

واتە: خوایە من داوات لێدەکەم بەوەی کەمن شایەتی ئەدەم کەتۆ ئەو خوایەیت کە هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لەتۆ. تەنیای جێی مەبەستی. ئەو خوایەی کەکەست لێنەبووەو لەکەس نەبوویتو کەس هاوشێوەی تۆ نییە.

٣- « رَبِّ اغفِرلي. وَتُبْ عَليَّ إنّكَ أنتَ التَوّابُ الغفور ».[٢١]

واتە: پەروەردگار لێم خۆش ببەو تۆبەم لێوەرگرە، بەڕاستی هەرتۆ تەوبە وەرگری لێبووردەی.

---

(٢٠) ابوداود ٧٩/٢ والترمذي ٥١٥/٥ وابن ماجه ١٢٦٧/٢ واحمد ٣٦٠/٥ وە بڕوانە صحيح السنن الترمذي ١٦٣/٣.

(٢١) ابوداود. والترمذي واللفظ له. والنسائي وابن ماجه ١٢٥٣/٢. وە بڕوانە صحيح ابن ماجه ٣٢١/٢ وصحيح الترمذي ١٥٣/٢.

## بەشی چواردەم:

# فەزڵ و گەورەیی( ذیکر )کردن

**خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ وَاشْكُرُوا لِي وَلَا تَكْفُرُونِ ﴾ (البقرة: ١٥٢).

**واتە: ذیکر و یادم بکەن، باس و یادتان دەکەم و بێ باوەڕی مەکەن بەرامبەرم.**[٢٢]

**وە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:** « مَثَلُ الَّذِي يَذْكُرُ رَبَّهُ وَالَّذِي لا يَذْكُرُ رَبَّهُ مَثَلُ الحَيِّ وَالمَيِّت »[٢٣]

**واتە: نمونەی ئەو کەسەی کە یادی پەروەردگاری دەکات و ئەوکەسەی کە یادی پەروەردگاری ناکات وەکو نمونەی زیندوو مردوو وایە.**

**وە دەفەرموێت(ﷺ):** « ما من قوم يقومون من مجلس لا يذكرون الله فيه إلاّ قاموا عن مثل جيفة حمار وكان لهم حسرةً »[٢٤]

---

(٢٢) مختصر تفسير ابن كثير ١٤٢/١.

(٢٣) البخاري مع الفتح ٢٠٨/١١ ومسلم به لفظي: « مَثَلُ البيتِ الَّذي يُذكَرُ الله فيه والبيتِ الَّذي لا يُذكَرُ الله فيهِ مَثَلُ الحَيِّ والمَيِّت » ٥٣٩/١

واتە: نمونەی ئەو ماڵەی یادی خوای تێدا دەکرێت و ئەو ماڵەی یادی خوای تێدا ناکرێ وەکوو نمونەی زیندووومردوو وایە.

(٢٤) أبوداود ٢٦٤/٤ وأحمد ٣٨٩/٢ بڕوانە صحيح الجامع ١٧٦:٥.

واتە: هەر کۆمەڵێك لەمەجلیسێکە هەستن و یادی خوایان نەکردبێ تیایدا. ئەوا وەکو ئەوە وایە کە لەسەر لاکی گوێ دریژێك هەڵسن و لەرۆژی دواییدا دەبێتە پەشیمانی بۆیان.

وە دەفەرموێت (ﷺ): «ألا أنبئكم بخير أعمالكم وأزكاها عند مليككم وأرفعها في درجاتكم وخير لكم من إنفاق الذهب والورق وخير لكم من أن تلقوا عدوكم فتضربوا أعناقهم ويضربوا أعناقكم؟ قالوا بلى قال: (ذكر الله)».[٢٥]

واتە: ئایا هەواڵتان پێدەمێ بەچاکترینی کردەوەکانتان و پاکترینیان لەلای خوای گەورەتان و بەرزترینیان لەپلەکانتان و چاکتر لەبەخشینی ئاڵتون و زیوو. وەچاکتر لەوەی کەبگەن بەدوژمنەکەتان و بدەن لەگەردنیان و بدەن لەگەردنتان؟ ووتیان: بەڵێ فەرمووی: یاد (ئیکر)کردنی خوای گەورە.

وە دەفەرموێت (ﷺ): «ما جلس قومٌ مجلسا لم يذكروا الله فيه. وَلَمْ يُصَلُّوا عَلَى نَبِيِّهِم إلاّ كانَ عَلَيهِم ترةٌ .فإنْ شاءَ عَذَّبَهُم وَإنْ شاءَ غفرَ لَهُم» [٢٦]

واته: هیچ کاتێك کۆمەڵێك دانانیشن لەمەجلیسێکدا کە ئیکری خوای تێدا نەکەن و صەڵاواتیان تیایدا نەدابێ لەسەر پێغەمبەرەکەیان (ﷺ) ئیلا دەبێتە خراپی و ناتەواوی و پەشیمانی بۆیان، ئەگەر خوای گەورە ویستی بێت سزایان دەدات و ئەگەر ویستی بوو لێیان خۆش دەبێ.

---

(٢٥) الترمذي ٥/٤٥٩ وابن ماجه ٢/١٢٤٥ وە بروانە صحيح ابن ماجه ٢/٣١٦ وصحيح الترمذي ٣/١٣٩.

(٢٦) الترمذي. وە بروانە صحيح الترمذي ٣/١٤٠.

## بەشی پێنجەم:

# لە هەڵس و کەوتە دووبارە بووەکانی ڕۆژانە هەستان لە خەو

١-« الحمدُ لله الّذي أحيانا بعْد ما أماتنا وإليهِ النُّشورُ ».[٣٧]

واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ژیاندینییەوە دوای ئەوەی کە مراندینی(مەبەست بە مراندنێکی مەجازییە کە خەوتنە) وە زیندوبونەوەش هەر بۆ لای ئەوە.

٢- پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: هەرکەسێك بەشەو بەخەبەر هات بڵێ: « لا إله إلاّ الله وَحْدَهُ لا شَريكَ لَهُ. لهُ المُلْكُ ولَهُ الحَمْـدُ وهُـوَ عَلى كُلِّ شيءٍ قَدير. سُبْحانَ الله والحمدُ لله ولا إلـهَ إلاّ الله، واللهُ أكبرُ. ولا حَوْلَ ولا قُـوةَ إلاّ بـالله العلـيِّ العظيـم » واتە: هیچ پەرستراوێك نییە بەحەق جگە لە(الله). تەنهایە بێهاوەڵە. موڵك و ستایش و سوپاس هەر بۆ ئەوە بەسەر هەموو شتێكدا بەتوانایە. پاکی هەربۆ خوایەو سوپاس بۆ خواو هیچ پەرستراوێك نییە بەحەق جگە لە(الله) وەخوا گەورەیەو هیچ گۆڕان و هێزێك نییە مەگەر بەخوای بەرزی مەزنەوە. - پاشان بپاڕێتەوەو بڵێ (ربِّ اغفِرلـي) پەروەردگار لێم خۆش بە. خـوا لێـی خـۆش دەبێـت) وەلیـد دەفـەرموێت: یـان فـەرمووی (ئەگـەر بپاڕێتـەوە وەڵامـی دەدرێتـەوەو

(٣٧) البخاري مع الفتح ١١٣/١١ ومسلم ٢٠٨٣/٤.

ئەگەر هەڵسێتەو دەست نوێژ بشۆرێ و پاشان نوێژ بکات نوێژەکەی وەرئەگیرێ)[٢٨]

٣- (الحمدُ لله الَّذي عافاني في جسدي وردَّ عليَّ روحي وأذنَ لي بذكرِه)[٢٩]

**واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە لەشی ساغی کردم و ڕۆحی بۆ گەڕاندمەوە بواری دام ئیکرو یادی بکەم.**

**٤- خوێندنی سورەتی (آل عمران) لە ئایەتی (١٩٠-٢٠٠):**

﴿ إنَّ في خلقِ السّموات والأرضِ واختِلافِ اللّيلِ والنّهارِ لآياتٍ لأولي الألباب* الّذين يذكرون اللهَ قياماً وقُعوداً وعلى جنوبِهم وَيَتَفكّرونَ في خلقِ السّمواتِ والأرضِ ربّنا ما خلقْتَ هذا باطِلاً سُبحانَكَ فقِنا عَذابَ النّار* رَبّنا إنّكَ مَنْ تُدخِلِ النّارَ فقدْ أخزَيتَهُ وَما للظّالِمينَ مِنْ أنصارٍ* رَبّنا إنّنا سَمِعْنا مُنادياً يُنادي للإيمانِ أن آمِنوا بِرَبّكُم فآمَنّا رَبّنا فَاغفِرْ لَنا ذُنوبَنا وكَفّرْ عَنّا سيّئاتِنا وتَوفّنا مَعَ الأبرارِ* رَبّنا وآتِنا ما وَعَدْتَنا عَلَى رُسُلِكَ وَلا تُخزِنا يَومَ القِيامةِ إنّكَ لا تُخلِفُ الميعادَ* فاستَجابَ لَهُم رَبُّهُم أنّي لا أُضيعُ عَمَلَ عاملٍ

---

(٢٨) البخاري مع الفتح ٣/٣٩ وغيره واللفظ لابن ماجه بروانه صحيح ابن ماجه ٢/٣٣٥.

(٢٩) الترمذي ٥/٤٧٣ وانظر صحيح الترمذي ٣/١٤٤.

مِنكُم مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ بَعْضُكُم مِنْ بَعْضٍ فَالَّذِينَ هَاجَرُوا وَأُخْرِجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ وَأُوذُوا فِي سَبِيلِي وَقَاتَلُوا وَ قُتِلُوا لَأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَ لَأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ ثَوَاباً مِنْ عِندِ اللهِ وَاللهُ عِندَهُ حُسْنُ الثَّوَابِ * لا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي البِلادِ * مَتَاعٌ قَلِيلٌ ثُمَّ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ المِهَادُ * لَكِنِ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ لَهُمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا نُزُلاً مِنْ عِندِ اللهِ وَمَا عِندَ اللهِ خَيْرٌ لِلأَبْرَارِ * وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ الكِتَابِ لَمَنْ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِمْ خَاشِعِينَ للهِ لا يَشْتَرُونَ بِآيَاتِ اللهِ ثَمَناً قَلِيلاً أُولَئِكَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ إِنَّ اللهَ سَرِيعُ الحِسَابِ * يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اصْبِرُوا وَصَابِرُوا وَرَابِطُوا وَاتَّقُوا اللهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾.(٣٠)

# پێش خەوتن

١- ( ئەگەر چووە ناو جێگەی نوستن دەستی بدات لەیەکەو پاشان فووی پێدابکات و سورەتی ﴿ قل هو الله أحد﴾ و ﴿ قل أعوذ برب الفلق ﴾ و ﴿ قل أعوذ برب الناس ﴾ ی پیادا بخوێنێ.

---

(٣٠) البخاري مع الفتح ٢٣٧/٨ ومسلم ٥٣٠/١.

پاشان دەستی بهێنێ بەسەر ئەو شوێنەدا کەتوانێ لە لەشی. وە لەسەری لەگەڵ دەمو چاوی و پێشەوەی لەشی یەوە دەست پێبکات، وە ئەمە سێ بارە بکاتەوە)[٣١]

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ قُلْ هوَ اللهُ احَدٌ* اللهُ الصَّمَدُ* لَمْ يَلِدْ ولَمْ يُولَد* ولَمْ يكُنْ لَهُ كُفُواً احَدٌ﴾

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ قُلْ اعوذُ برَبِّ الفَلَقِ * مِنْ شَرِّ ما خَلَقَ * وَمِنْ شَرِّ غاسِقٍ إذا وَقَبَ * وَمِنْ شَرِّ النفَّاثَاتِ في العُقَدِ* وَمِنْ شَرِّ حاسِدٍ إذا حَسَد ﴾.

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ قُلْ اعوذُ برَبِّ النَّاسِ * مَلِكِ النَّاسِ * إلهِ النَّاسِ * مِنْ شَرِّ الوَسواسِ الخَنَّاسِ * الَّذي يُوَسوِسُ في صُدورِ النَّاسِ * مِنَ الجِنَّةِ وَ النَّاسِ ﴾.

٢- «ئەگەر چویتە سەر جێگاکەت( آيـةَ الكُرسـي ) بخوێنەو تەواوی بکە. چونکە پارێزەرێکت لەلایەن خواوە لەگەڵدا دەبێت و. شەیطان نزیکت ناکەوێتەوە تا بەیانی»[٣٢]

(٣١) البخاري مع الفتح ٦٢/٩ ومسلم ١٧٢٣/٤ چونکە پێغەمبەر(ﷺ) ئاوای دەکرد.

(٣٢) البخاري مع الفتح ١٨٧/٤.

أعوذ بالله مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيم

﴿ اللهُ لا إلهَ إلاّ هُوَ الحَيُّ القَيّومُ لا تأخُذُهُ سِنَةٌ وَ لا نَومٌ لَهُ ما في السَّمواتِ وَما في الأرضِ مَنْ ذا الّذي يَشفَعُ عِندَهُ إلاّ بإذنِهِ يَعلَمُ ما بَينَ أيديهِم وَما خَلفَهُم وَلا يُحيطونَ بشَيءٍ مِنْ عِلمِهِ إلاّ بِما شآءَ وَسِعَ كُرسيُّهُ السَّمواتِ والأرضِ ولا يَؤُدُهُ حِفظُهُما وهوَ العَليُّ العَظيمُ ﴾.

٢- « هەرکەسێ دوو ئایەتی کۆتایی سورەتی(البقرة) بخوێنێ لە شەودا ئەبێتە پاراستن بۆی و بەسیەتی »[٢٣]

أعوذ بالله مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيم

﴿ آمَنَ الرَّسولُ بِمآ أُنزِلَ إليهِ مِنْ رَبِّهِ وَالمؤمِنونَ كُلٌّ آمَنَ باللهِ وَملآئِكتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لا نُفَرِّقُ بينَ أحَدٍ مِنْ رُسُلِهِ وَقالوا سَمِعنا وَأطَعْنا غُفرانَكَ رَبّنا وَإليكَ المَصيرُ * لا يُكَلِّفُ اللهُ نَفساً إلاّ وُسعَها لَها ما كَسَبَتْ وَعَليها ما اكتَسَبَتْ رَبّنا لا تُؤاخِذنا إنْ نَسينا أو أخطأنا رَبّنا وَلا تَحمِلْ عَلَينا إصراً كَما حَمَلتَهُ عَلى الّذينَ مِنْ قَبلِنا رَبّنا وَلا تُحمِّلنا ما لاطاقَةَ لَنا بِهِ وَاعفُ عنّا وَاغفِرْ لَنا وَارحَمْنا أنتَ مَولانا فانصُرْنا عَلى القَومِ الكافِرينَ ﴾.

---

(٢٣) البخاري مع الفتح ٩/٩٤ ومسلم ١/٥٥٤.

٤- ﴿ قُلْ يا أيّها الكافرونَ ﴾ بخوێنە چونکە بۆت دەبێتە (بەرائەت لە شيرك)[٣٤]، واتە: بێگار بوون يان قوتار بوون لە هاوبەشی پەيدا كردن(وە سوود بەخشە بۆ يەكتاپەرستی).

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ قُلْ يا أيّها الكافرون * لا أعبُدُ ما تعبُدون * ولا أنتم عابدون ما أعبُدُ * ولا أنا عابدٌ ما عبدتم * ولا أنتم عابدون ما أعبُدُ * لكُم دينُكُم ولي دين ﴾

٥- ( ئەگەر لەسەر جێگاكەت هەستايت و گەڕايتەوە سەری. سێ جار بە لۆچێكی كراس و جلەكەت جێگاكەت بتەكێنە. وە (بسم الله) بكە چونكە تۆ نازانی دوای خۆت چی لێ چووە لە زيندەوەرو شتی زيان بەخش وە كە ڕاكشايت بڵێ : « باسمِكَ رَبّي وضعتُ جَنبي وَبكَ أرفَعُهُ فإنْ أمسَكْتَ نفسي فارحَمْها . وإنْ أرسلْتَها فاحفظْها بما تحفَظُ بهِ عِبادَكَ الصّالحينَ ».[٣٥]

---

(٣٤) لە( فەروەی كوڕی نوفل ) دەوە ئەڵێ هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەی پێغەمبەری خوا شتێكم فێربكە كە چوومە سەر جێگاكەم بیڵێم. فەرمووی فەرمووی... فەرمووی) رواه الترمذي وابوداود وقد صححه الالباني في صحيح السنن الترمذي ٣/١٤٥. وفي صحيح سنن ابي داود ٣/٩٥٣ - ٩٥٤ رقم(٥٠٥٥) وَ فيه: عن فروة بن نوفل عن ابيه وە زیادەیەکی تێدایە لە( سنن ابی داود)دا فەرمووی ئەمەیە: (پاشان بە كۆتایی بخەوە، چونكە بۆت دەبێتە بەرائەت لە شيرك).

(٣٥) البخاري ١١/١٣٦ ومسلم ٤/ ٢٠٨٤ .

واتە: بەناوی تۆ پەروەردگارم تەنیشتم داناو بەناوی تۆوە بەرزی دەکەمەوە . ئەگەر نەفسی منت گرتەوە بەزەیت پێدا بێتەوە . وە ئەگەر ناردتەوە ئەوا بیپارێزە بەوەی کەبەندە صالحەکانتی پێ دەپارێزی.

٦- « اللهُمَّ إنَّكَ خَلَقْتَ نَفْسي وَأنتَ تَوَفَّاها، لَكَ مَماتُها وَمَحْياها. إنْ أحيَيْتَها فاحفَظها . وإن أمَتَّها فاغْفِرْ لَها. اللهُمَّ إنِّي أسألُكَ العافيةَ ». (٣٦)

واتە: خوایە تۆ نەفسی منت بەدیهێناوەو تۆ دەیمرێنی. مردن و ژیانی بۆ تۆیە. ئەگەر ژیاندت بیپارێزەو ئەگەر مراندت لێی خۆش ببە. خوایە داوای پارێزراویو لەش ساغیت لێدەکەم.

٧- پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر بیویستایە بخەوێت دەستی راستی دەخستە ژێر رووومەتی و دەیفەرموو: « اللهُمَّ قِني عَذابَكَ يَومَ تَبعَثُ عِبادَكَ ». (٣٧) واتە: خوایە بمپارێزە لەسزاکەت لەو رۆژەدا کەبەندەکانت زیندوو دەکەیتەوە.

٨- « باسْمِكَ اللهُمَّ أمُوتُ وَأحيا » (٣٨)

واتە: بە ناوی تۆوە خوایە دەمرم و دەژیم.

٩- « ئایا شتێکتان پێ بڵێم کە چاکتر بێت بۆ هەریەکێکتان لەخزمەتکارێك، ئەگەر چوونە سەر جێگا (٣٣) جار (سُبحانَ الله) و

(٣٦) أخرجه مسلم ٢٠٨٣/٤ وأحمد بلفظه ٧٩/٢ .

(٣٧) أبوداود بلفظه ٣١١/٤ وانظر صحيح الترمذي ١٤٣/٣ .

(٣٨) البخاري مع الفتح ١١٣/١١ ومسلم ٢٠٨٣/٤ .

(٣٣) جار (الحَمْدُلله)و (٣٤) جار (الله أكبر)بكەن ئەوە چاكترە بۆ ئێوە لە خزمەتكار ».[٣٩]

١٠- «اللهُمَّ رَبَّ السَّمواتِ السَّبعِ. وَرَبَّ العَرشِ العَظيمِ. ربنا وَرَبَّ كُلِّ شيءٍ. فالِقَ الحَبِّ وَالنَّوى. ومُنـزِلَ التَّـوراةِ والإنجيـلِ. والفُرقانِ. أعوذُ بكَ مِنْ شرِّ كُلِّ شيءٍ أنتَ آخِذٌ بناصيَتِهِ. اللّهُمَّ أنـتَ الأوَّلُ فليسَ قَبْلَكَ شيءٌ. وأنتَ الآخِرُ فليسَ بَعْدَكَ شـيءٌ. وأنـتَ الظّاهِرُ فلَيسَ فوقَكَ شيءٌ. وَأنتَ الباطِنُ فَلَيسَ دُونَكَ شيءٌ. اقـضِ عَنّا الدَّينَ واغنِنا مِنَ الفَقرِ».[٤٠]

واتە: خوایە [illegible] پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکانو پەروەردگاری عەرشی گەورە[illegible] پەروەردگارمانو پەروەردگاری هەموو شتێك. لەتکەری تۆوی دانەوێڵەو ناوکەو دابەزێنەری تەوراتو ئینجیلو قورئان، پەنادەگرم پێت لەخراپەی هەموو شتێك کە ناوچەوان و چارەنوس و نسیبی بەدەست تۆیە. خوایە تۆ یەکەمینیو کەس لەپێش تۆوە نییە تۆ دوایەمینیو کەس لەدوای تۆوە نییەو تۆ بەدەسەڵات و زاڵ و دیارو ئاشکرایت بە زانستت و کەس لەسەرو تۆوە نییەوتۆ پەنهانی بەسەر هەموو شتێك دا بەزانستت وبەئاگای بەشاراوەکانو جێ نیاز نییە جگە لە تۆ. بۆ ئەرزاریمان لەسەر هەڵگرەو بێنیازو دەوڵەمەندمان بکە لە هەژاری.

---

(٣٩)پێغەمبەری خوا (ﷺ)ئەمەی بە ئیمامی عەلی و فاطمەی کچی فەرموو کاتێ داوای خزمەتکاریان لێ کرد کە بۆیان بگرێ/ البخاري مع الفتح ٧١/٧ ومسلم٤/٢٠٩١.

(٤٠)مسلم ٤/ ٢٠٨٤.

١١- « الحَمْدُ لله الّذي أطْعَمَنا وَسَقَانا. وَكَفانا. وآوانا. فكَم مِمَّن لا كافِيَ لَهُ وَلا مؤوِيَ ».[٤١]

واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە تێری کردین و تێرئاوی کردین و پێویستی نەخستینە غەیری خۆی و کیفایەتی داین و جێنشینی کردین. زۆر کەس هەیە خوا بە بەس نازانێ.( بە هاوبەش دانان بۆی). وە موڵکەی نیشتەجێی نییە.

١٢- « اللّهُم عالمَ الغَيبِ وَالشّهادَةِ. فـاطِرَ الـسّمواتِ وَالأرضِ. رَبَّ كُلِّ شيءٍ وَمَليكَهُ. أشهَدُ أنْ لا إلهَ إلاّ أنتَ. أعوذُ بِكَ مِنْ شَـرِّ نَفسـي وَمِنْ شَرِّ الشَيطانِ وَشِركِهِ. وأنْ اقترِفَ عَلى نَفسـي سُـوءاً أو أجُرَّهُ إلى مُسلِم ».[٤٢]

واتە: خوایە ئەی زانای غەیب و ئاشکرا. ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی. پەروەردگار و پاشای هەموو شتەکان. شایەتی ئەدەم کە هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لەتۆ. پەنا دەگرم پێت لە خراپەی نەفسم. وە لە خراپەی شەیطان و هاوبەش دانانی. وە لەوەی کە خراپەیەك بهێنم بەسەر نەفسمدا یان بیدالێنم لە موسڵمانێکەوە.

١٣- پێغەمبەر(ﷺ) نەدەخەوت هەتا سورەتی (السّجدة) ﴿ آلم.. تنزيل .. ﴾ و ﴿ تبارَكَ الّذي بِيَدِهِ المُلكُ.. ﴾ ی دەخوێند.[٤٣]

---

(٤١) مسلم ٤/٢٠٨٥.
(٤٢) أبوداود ٤/٣١٧ وانظر صحيح الترمذي ٣/ ١٤٢.
(٤٣) الترمذي والنسائي وانظر صحيح الجامع ٤/٢٥٥. لەگەڵ سورەتی ( الاسراء ) و ( الزمر ) دا. الصحيحة(٦/٦٤٢) رقم الحديث: ( ٦٤١).

١٤- ئەگەر چوویتە سەرجێگای نوستن دەست نوێژ بشۆرەو پاشان لەسەر لای ڕاستت ڕابکشێ و پاشان بڵێ

« اللهُمَّ أسلَمْتُ نَفسي إليكَ. وَفوَّضْتُ أمري إليكَ. وَوَجَّهْتُ وَجْهي إليكَ. والجَأتُ ظَهري إليكَ. رَغبَةً وَرَهبَةً إليكَ. لامَلْجأ وَلا مَنجا مِنكَ إلاّ إليكَ. آمنتُ بِكِتابِكَ الَّذي أنزَلْتَ وَبِنَبِيِّكَ الَّذي أرسَلْتَ ».(٤٤)

واتە خوایە نەفسم تەسلیمی تۆ کردو کاروباری خۆم دایە دەستی تۆ. وە ڕووم کردە تۆو پشتم بەست بەتۆ. بە پێی خۆشبوون حەزو پێکردن و بەترسان لە تۆ. هیچ حەشارگەو شوێنی ڕزگاربوونێک نییە مەگەر بۆلای تۆ. باوەڕم هێناوە بەکتێبەکەت کە دابەزاندوتە خوارەوە، وە بەو پێغەمبەرەت (ﷺ) کەناردوتەو ڕەوانەت کردووە.

---

(٤٤)ئەگەر ئەمە بڵێیت و بمریت لەسەر فیطرەت دەمری. (وە باکۆتا شتێک بێت کە دەیڵێیت). البخاري مع الفتح ١١/ ١١٣ ومسلم ٢٠٨١/٤.

تێبینی/ سوننەتە ئەگەر لەشی گران بوو دەست نوێژ بشۆری پێش خەوتن. لە عبداللە وە ئەفەرمووێ: عومەر پرسیاری لە پێغەمبەر (ﷺ)کرد: ئایا یەکێک لە ئێمە ئەتوانێت بخەوێت بە لەش گرانیەوە؟ فەرمووی: « بەڵێ ئەگەر دەست نوێژی هەڵگرت »البخاري ٣٩٢/١، وە هەروەها بوخاری ڕیوایەتی کردووە لەعائیشەوە لە کرداری پێغەمبەرەوە (ﷺ)کە خۆی وای کردووە ٣٩٢/١ .

## وەرگەڕان لەسەر جێگا لە شەودا
## ( لە بارێکەوە بۆ بارێك )

لە عائیشەوە( ڕەزای خوای گەورەی لێ بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر لە شەودا وەربگەڕایەتە سەرلایەکی تری دەیفەرموو: « لا إِلهَ إِلاّ اللهُ الواحِدُ القَهّار. رَبُّ السَّمواتِ وَالأرضِ وَما بَينَهُما العَزيزُ الغَفّار »[١٥]

واتە:هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لە(الله) ی تاکی سزا دەری بێ بەرامبەر وشکەرەکەی. کە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوییە و ئەوەی لە نێوانیاندایەو دەسەڵاتداری لێ بووردەیە.

## داچڵەکین لە خەودا و خەو لێنەکەوتن

« أعوذُ بِكَلماتِ اللهِ التّامّات مِنْ غَضَبِهِ وَعِقابِهِ. وشَرِّ عِبادِهِ وَمِن هَمَزاتِ الشَّياطِينِ وأن يَحضُرونِ »[١٦]

واتە: پەنا ئەگرم بە وشە تەواوەکانی خوای گەورە لەخەشم و سزایو لە خراپەی بەندەکانیو لە شێتی شەیطانەکان و لەو کاتانەی کە لە ژیاندا دێنە لام بۆ گومڕاکردنم یان کاتێ لەسەر مەرگ دام دێنە لام.

---

(١٥) أخرجه الحاكم وصححه ووافقه الذهبي ١/٥٤٠ والنسائي في عمل اليوم والليلة وابن السني وصححه الألباني. وانظر صحيح الجامع ٤/٢١٣.

(١٦) أبو داود ٤/ ١٢ وانظر صحيح الترمذي ٣/١٧١. وهو حديث حسن، حسّنه الألباني في صحيح أبي داود برقم(٣٢٩٤) بلفظ متقارب.

# ئەگەر خەونی ڕاست و خۆش[illegible]

# یان خەونی درۆ و ناخۆش[illegible] بینی

خەونی خۆش و چاك لە لایەن خواوەیەو خەونی ناخۆش لە شەیطانەوەیە. ئەگەر یەكێك لە ئێوە خەونی خۆشی بینی با لە لای خۆشەویستی خۆی نەبێ باسی نەكات... فەرموودەكە... (٤٧)

وە كورتەی ئەو شتانەی كە دەیكات لەكاتی بینینی خەونی ناخۆش دا ئەمانەن:

١- سێ جار تف دەكات بە لای چەپیدا. (٤٨)

٢- سێ جار پەنا دەگرێ بەخوای گەورە لە شەیطان و لە خراپەی ئەوەی كە بینوویەتی. (٤٩)

٣- لە لای كەس باسی ناكات و نایگێڕێتەوە. (٥٠)

٤- لەسەرئەو لایە وەردەگەڕێ كە لەسەری بووە. (٥١)

٥- هەڵدەستێ و نوێژ دەكات ئەگەر ویستی. (٥٢)

---

: مسلم بلفظه ١٧٧٢/٤ والبخاري ٢٤/٧.

: مسلم ١٧٧٢/٤.

مسلم ٤/ ١٧٧٢، ١٧٧٣.

مسلم ١٧٧٢/٤.ئەمەش لەوانەیە حیكمەتەكەی ئەوە بێت تا حەسوودی پێ نەبرێت... [illegible]

مسلم ١٧٧٣/٤.

: مسلم ١٧٧٣/٤.

# ذیکری بەیانیان و ئێواران و کاتی خوێندنیان

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا اللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا • وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴾. (الاحزاب: ٤١ ، ٤٢)

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ذیکری خوا بکەن بە ذیکرێکی زۆرو تەسبیحاتی ئەو بکەن و بە پاك رایگرن لە بەیانیان و ئێواران دا.[٥٣]

(بكرة): لە زمانی عەرەبیدا بە نێوان نوێژی بەیانی و خۆرهەڵاتن دەوترێ.[٥٤]

(أصيل) : الجوهري دەڵێت: ئەو کاتەیە لە پاش نوێژی عەسرەوە تاوەکو نوێژی شێوان(مەغریب).[٥٥]

وە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ ﴾( ق: ٣٩)

واتە: تەسبیحات و ستایشی خوای پەروەردگارت بکە لە پێش خۆر کەوتن و پێش ئاوابوونیدا.

---

(٥٣) مختصر تفسير ابن كثير ١٠١/٢.

(٥٤) بڕوانە (مختار الصحاح) للرازي (ب ك ر) و هەروەها (غ د ا).

(٥٥) بڕوانە (الصحاح) للجوهري (أ ص ل) هەروەها (مختار الصحاح) للرازي (أ ص ل). وانظر لسان العرب ١٧/١١.

ابن القيم (ڕەحمەتی خوای گەورەی لێ بێت)دەفەرموێت: ئەمەش ڕاڤەی ئەو مانایەیە کە لە فەرموودەکاندا هاتووە کە دەفەرموێ هەرکەسێ لە بەیانیان و ئێوارانددا ئاوا و ئاوا بڵێ: مەبەست بە بەیانی و ئێوارە لە فەرموودەکاندا پێش هەڵهاتنی خۆرو پێش ئاوا بوونیەتی. وە ئەمە کاتی ووتنی ذیکرەکانی دوای بەیانی و دوای عەسرە.[٥٦]

عن انس يرفعه: « لإنْ أقْعُدَ مَعَ قَومٍ يَذكرونَ اللهَ تعالى مِـــن صَـــلاةِ الغَداةِ حَتّى تَطلُعَ الشَّمسُ احَبُّ إليَّ مِنْ انْ أعتِقَ اربعــةً مِـــنْ وَلَـــدِ إسماعيل. ولأن أقعُدَ مَعَ قَومٍ يَذكرون اللهَ مِنْ صَـــلاةِ العَـــصْرِ إلى أنْ تَغْرُبَ الشَّمسَ أحبُّ إليَّ مِن أنْ أعتِق أربعة »[٥٧]

واتە: ئەگەر لەگەڵ کۆمەڵێك دا دانیشم کە ذیکری خوای گەورە بکەن لەنوێژی بەیانیەوە تا خۆرهەڵاتن لام خۆشترە لەوەی کە چوارکەس لەنەوەکانی ئیسماعیل پێغەمبەر(عليه الصلاة و السلام) ئازاد بکەم، وەئەگەر لەگەڵ کۆمەڵێك دابنیشم کە ذیکری خوای گەورە بکەن لەنوێژی عەسرەوە تا خۆرئاوا دەبێ لام خۆشترە لەوەی چوار کەس ئازاد بکەم.

---

(٥٦) الوابل الصيب لابن القيم ص ١٩٢.

(٥٧) ابوداود برقم (٣٦٦٧) وحسَّنهُ الالباني. صحيح ابوداود ٦٩٨/٢.

# ذیكرەكانی بەیانیان و ئێواران

١- (( هەر كەسێك بەیانیان(آية الكُرسي) بخوێنێت لە جنۆكە دەپارێزرێ هەتا ئێوارەی لێ دەبێتەوە.وە هەر كەس ئێوارە بیخوێنێ دەپارێزرێ لێیان تا بەیانی )) (٥٨)

٢- لە عبدالله ی كوڕی خوبەیبەوە فەرمووی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (قُل) واتە: بڵێ، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا چی بڵێم؟ فەرمووی: ﴿ قُلْ هوَ الله أحَد ﴾ و﴿ الفَلَق ﴾ و﴿ الناس ﴾ بخوێنە ئێواران و بەیانیان سێ جار بەسەتە لە هەموو شتێك دەپارێزرێت(٥٩)

٣- بەیانیان بڵێ: (( أصبحنا وأصبحَ المُلكَ لله(٦٠) ، وَالحمدُ لله لا إله إلاّ الله وَحدهُ لا شريكَ لهُ. لهُ المُلكُ وَلَهُ الحمدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شيءٍ قديرٌ. رَبِّ أسألُكَ خيرَ ما في هذا اليوم وَخيرَ ما بعدَهُ.(٦١) وأعوذُ بكَ مِنْ شرِّ ما في هذا اليوم وَشرِّ ما بَعْدَهُ. رَبِّ أعوذُ بكَ

---

(٥٨) أخرجه الحاكم ٥٦٢/١ وصححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب ٢٧٣/١ وعزاه الى النسائي والطبراني وقال: إسناد الطبراني جيد. بڕوانە لاپەڕە(٣٢) بۆ (آية الكرسي).

(٥٩) أخرجه أبوداود ٣٢٢/٤ والترمذي ٥٦٧/٥ وانظر صحيح الترمذي ١٨٢/٣. وهو حديث حسن.

(٦٠) وە ئێواران بڵێ: (( أمسينا وأمسى المُلكُ لله.......)).

(٦١) وە ئێواران بڵێ: رَبِّ أسألُكَ خيرَ ما في هذه اللَّيلةِ وَخيرَ ما بعدَها وَ أعوذُ بكَ مِنْ شرِّ ما في هذه اللَّيلةِ وَشرِّ ما بَعْدَها.......

من الكسل وسوء الكبر رب أعوذ بك من عذاب في النار وعذاب في القبر »[٦٢]

**واته: بەیانیمان بەسەردا هات و موڵك بەیانی بەسەردا هات بۆ خوای گەورە، وە ستایش بۆ خوایەو هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لە (الله)تەنهایەو هاوبەشی نییە. موڵك و سوپاس بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێكدا بە توانایە. پەروەردگار داوای خێری ئەمڕۆو خێرو چاكەی دوای ئەمڕۆت لێ دەكەم و پەنات پێ ئەگرم لە خراپەی ئەوەی لەمڕۆدایەو لە دوای ئەمڕۆدایە. پەروەردگار پەنات پێ ئەگرم لە تەمبەڵیو لەش قورسیو خراپەی تەمەن پیری. پەروەردگار پەنات پێ ئەگرم لە سزایەك لە ئاگری دۆزەخ و سزایەك لە گۆڕدا تووشم ببێت.**

٤- « اللهمَّ بكَ أصبحنا وبكَ أمسينا[٦٣] وبكَ نحيا وبكَ نموتُ وإليكَ النشور »[٦٤]

**واته: خوایە بە ناوی تۆوە بەیانیمان بەسەردا هات و ئێوارەمان بەسەردا هاتوو بەناوی تۆوە دەژیم و دەمرم و زیندوو بوونەوە بۆ لای تۆیە.**

---

(٦٢)مسلم ٢٠٨٨/٤.

(٦٣)وە ئێواران بڵێ: « اللهمَّ بكَ أمسينا و بكَ أصبحنا و بكَ نحيا و بكَ نموتُ و إليكَ المصير » واته: خوایە بەناوی تۆوە ئێوارەمان بەسەردا هات و بە ناوی تۆوە بەیانیمان بەسەردا هات و بە ناوی تۆوە دەژیم و دەمرم وە چارەنووس بۆلای تۆیە.

(٦٤)الترمذي ٥/ ٤٦٦ وانظر صحيح الترمذي ١٤٢/٣.

٥- (( اللهمَّ أنتَ رَبّي لآ إلهَ إلاّ أنتَ خَلَقْتَني وَأنا عَبدُكَ، وَأنا علــى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ ما استَطَعْتُ. أعوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ ماصَنَعْتُ. أبوءُ لَــكَ بِنعمَتِكَ عَلَيَّ وَأبوءُ بِذنبــي. فــاغفِر لي فإنَّــهُ لا يَغفِــرُ الــذُنوبَ إلاّ أنتَ )).(٦٥)

**واتە: خوایە تۆ پەروەردگارمی هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لە تۆ. بەدیت هێناوم و من بەندەی تۆم و من لەسەر پەیمان و بەڵێنەکەمم کە بەتۆم داوە تا بتوانم. پەنات پێ دەگرم لەخراپەی ئەوەی ئەنجامم داوە لە گوناه. دان ئەنێم بە نیعمەتەکانتدا لەسەرم و دان ئەنێم بە گوناهەکانم دا. ساخوایە لێم خۆش بە ، بە ڕاستی کەس لە گوناه خۆش نابێ جگە لە تۆ.**

٦- (( اللهُمَّ عافِني في بَدَني. اللهمَّ عافِني في سَمعي. اللهُمَّ عافِني في بَصَري. لآ إلهَ إلا أنتَ. اللهمَّ إني أعوذُ بِكَ مِنَ الكُفرِ وَالفَقْرِ. وأعوذُ بِكَ مِن عَذابِ القَبرِ لآ إلــهَ إلا أنــتَ )) **بەیانیان و ئێواران سێ جار.**(٦٦)

---

**(٦٥) هەرکەسێ ئێوارە بەیەقینەوە بیڵێ و شەو بمرێ دەچێتە بەهەشتەوە. وە هەرکەسێ بەیانی بە یەقینەوە بیڵێ و ئەو ڕۆژە بمرێ دەچێتە بەهەشتەوە/ أخرجه البخاري ٧/١٥٠.**

**(٦٦) رواه أحمد (٥/٤٢) وأبوداود (٤/٣٢٤) والنسائي في عمل اليوم والليلة (ص١٤٦) رقم (٢٢) وابن السني في عمل اليوم والليلة (ص٣٥) رقم (٦٩) والبخاري في(الأدب المفرد) رقم (٧٠١) وحسَّنَهُ سماحة الشيخ عبدالعزيز بن باز(رَحِمَهُ الله) فيتحفة الأخيار (ص٢٦) والعلامة الألباني في صحيح الجامع (٣٣٨٢).**

واتە: خوایە لەش و بیستن و بینینم پارێزراو بکە هیچ پەرستراوێك نییە بەحەق جگە لەتۆ. خوایە پەنات پێ ئەگرم لە بێ باوەڕیو هەژاریو پەنات پێ ئەگرم لە سزای گۆڕ، هیچ پەرستراوێك نییە بە حەق جگە لە تۆ.

٧- «اللهمَّ إني أسألك العفو والعافيةَ في الدُّنيا والآخرة. اللهمَّ إني أسألك العفو والعافية في ديني ودُنياي وأهلي ومالي. اللـهُمَّ استر عَوراتي وآمِن روعاتي. اللهُمَّ احفظني مِنْ بَين يَدَيَّ وَمِنْ خَلفي. وعَنْ يميني وعَن شمالي. وَمِنْ فوقي. وأعوذُ بعظمتِك أنْ أُغتالَ مِن تحتي» بەیانیان و ئێواران.(٦٧)

واتە: خوایە من داوای لێخۆش بوون و پارێزراویت لێ دەکەم لە دنیاو دوا ڕۆژدا. خوایە داوای لێ بووردن و پارێزراویت لێ دەکەم لە دین و دنیاو کەس و کارو ماڵ و سەروەتم دا. خوایە عەیبم داپۆشەو ترس و دڵەڕاوکێو وەرست بوونم مەهێڵە. خوایە بمپارێزە لە بەردەمەوەو لە دواوەمەوە لە ڕاستم و چەپم و سەرەوەم. وەپەنا ئەگرم بە گەورەیی تۆ کە لە ژێرەوە سزا بدرێم و پێ بکرێم.

(٦٧) رواه أبوداود برقم(٥٠٧٤) وصحَّحَهُ الألباني في صحيح أبو داود برقم(٤٢٣٩) وابن ماجه وصحَّحه ووافقه الذهبي. وحَسَّنهُ الحافظ في (أمالي الأذكار) انظر صحيح ابن ماجه ٢/٣٣٢ وصحيح الكلم الطيب (ص٢٤) رقم (٢٣) للعلامة الألباني.

٨- « اللَّهُمَّ عالِمَ الغَيبِ والشَّهادَةِ، فاطِرَ السَّمواتِ والأرضِ، رَبَّ كُلِّ شيءٍ ومَليكَهُ، أشهَدُ أن لآ إلهَ إلا أنتَ، أعوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نفسي، ومِن شَرِّ الشَّيطانِ وشِركِهِ، وأن أقترِفَ على نفسي سُوءاً أو أجُرَّهُ إلى مُسلِمٍ » بەيانيان و ئێواران.[٦٨]

**واته: خوایە زانای نهێنیو ئاشكرای، بەدیهێنەری ئاسمانەكان و زەوی پەروەردگارو پاشای هەموو شتێك. شایەتی ئەدەم كە هیچ پەرستراوێك نییە بە حەق جگە لەتۆ. پەنا ئەگرم پێت لە خراپەی نەفسم و لە شەڕو خراپەو هاوبەش دانانی شەیطان. وە لەوەی كە نەفسم تووشی خراپەیەك بكەم یان بیگەیێنم لە موسڵمانێكەوە.**

٩- « بِسمِ اللهِ الَّذي لا يَضُرُّ مَعَ اسمِهِ شَيءٌ في الأرضِ وَلا في السَّماءِ وَهوَ السَّميعُ العَليم » **بەيانيان و ئێواران سێ‌جار.**[٦٩]

**واته: بە ناوی ئەو خوایەی لەگەڵ ناوی ئەودا هیچ شتێك زیان ناگەیەنێ نە لە زەوییو نە لە ئاسماندا ئەو خوایە بیسەرو زانایە.**

---

(٦٨) الترمذي وأبوداود وانظر (صحيح الترمذي ٣/١٤٢). وصحيح الكلم الطيب (ص٢٢، ٢٦) للعلامة الألباني.

(٦٩) هەركەسێ بەيانيان سێ جار و ئێواران سێ‌جار بیڵێ هیچ زیانی پێ ناگەیەنێ/ أخرجه أبوداود رقم(٤/٣٢٣) وصحّحَهُ الألباني في صحيح أبي داود برقم(٤٢٤٤) والترمذي ٥/٤٦٥ وابن ماجه وأحمد. انظر صحيح ابن ماجه ٢/ ٣٣٢ وصحيح الترمذي ١٤١/٣. وحَسَّنَ إسناده العلامة ابن باز في تحفة الأخيار (ص٣٩).

١٠- بەیانیان یەك جار بڵێ: « رَضِيتُ بِاللهِ رَبّاً.وَبالإسْلامِ دِيناً وَبِمُحَمَّدٍ(ﷺ) نَبِيّاً ».[٧٠]

واتە: ڕازیم بە (الله) کە پەروەردگارم بێ‌و ئیسلام دین و بەرنامەم بێت و موحەممەدیش(ﷺ) پێغەمبەرو پێشەوام بێت.

١١- « يا حَيُّ يا قَيُّومُ بِرَحْمَتِكَ أسْتَغيثُ. أصلِح لي شأْنِي كُلَّهُ، وَلا تَكِلْني إلى نَفْسي طَرْفَةَ عَيْنٍ » بەیانیان و ئێواران.[٧١]

واتە: ئەی زیندووی ڕاگرو هەڵسوڕێنەری بوونەوەر، بە بەزەییت داوای فریاکەوتنت لێ دەکەم. هەموو کاروبارم چاك بکەو بۆ چاولێك نانێك مەمدەرە دەستی نەفسی خۆم.

---

(٧٠)هەر کەسێ بەیانیانی هەموو ڕۆژێك بڵێ ......(لەفەرموودەکە)... من کەفیل و گرەنتی دەدەمێ کە دەستی بگرم تا دەیبەمە بەهەشتەوە). أورده المنذري في الترغيب ١/٢٢٩ وقال: رواه الطبراني بإسناد حسن. انظر سلسلة الصحيحة مجلد (٦) رقم (٢٦٨٦).وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە کە هەر کەسێك بەیانیان و ئێواران سێ‌جار بیڵێ ئەوا مافە لەسەر خوای گەورە(کە خوای گەورە خۆی بە مافی داناوە) کە لە ڕۆژی دواییدا ڕازی بکات / رواه احمد ٤/٣٣٧ والنسائي وابن السني وابوداود والترمذي وحسنه ابن باز في تحفة الأخيار/ص٢٩ بەڵام شێخی ئەلبانی(ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێت) ئەم لەفزەی بە ضعیف داناوە/ بڕوانە ضعیف الجامع(٥٧٢٥) و (٥٧٢٤).

(٧١) رواه النسائي والبزار والحاكم وصححه و وافقه الذهبي ١/٥٤٥ ورواه ابن السني برقم (٤٨) وحسّنهُ الارنؤوط في الزاد ٢/ ٣٧٥ وصححه الالباني في صحيح الترغيب والترهيب ١/ ٢٧٣.

١٢- «أَصْبَحْنا عَلى فِطْرَةِ الإِسْلامِ[٧٢] وَعَلى كَلِمَةِ الإِخْلاصِ. وَعلى دِينِ نَبِيِّنا مُحَمَّدٍ(ﷺ). وَعلى مِلَّةِ أَبِينا إِبراهِيمَ حَنِيفاً مُسْلِماً وَما كانَ مِنَ المُشْرِكِينَ»[٧٣]

واتە: بەیانیمان بەسەردا هات لەسەر فیطرەتی ئیسلام و وشەی دڵسۆزیی و ئیخلاص کە بریتییە لە (لا إلـه إلا الله) وە دینی پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) و لەسەر میللەتی باوکمان ئیبراهیم پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) کە لای دابوو لە بەتاڵەوە بۆ هەق و موسڵمان بووەو لە هاوبەش دانەران نەبووە.

١٣- «سُبْحانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ» سەد جار[٧٤]

واتە: تەواوی و بێ کەم و کوڕیی و سوپاس و ستایش بۆ خوایە.

---

(٧٢) ئێواران بڵێ: «أمسينا على فطرة الإسلام......»

(٧٣) رواه احمد ٢/٤٠٦،٤٠٧ وايضاً ٥/١٢٣ والدارمي ٢/٢٩٢ وابن السني في عمل اليوم والليلة ص ١٢ رقم (٣٤). وانظر صحيح الجامع الصغير ٤/٢٠٩ رقم (٤٦٧٤) للعلامة الالباني. وحسّنه ابن حجر في نتائج الافكار ٢/٣٧٩.

(٧٤) (هەرکەسێ بەیانیان(سەد)جارو ئێواران(سەد) جار بڵێ لەرۆژێکدا کەس لە رۆژی دواییدا بەکردەوەی لەم باشترەوە نایەت مەگەر کەسێک وەک ئەمی وتبێ یان ئیکری زیاتری وتبێ). مسلم ٤/٢٠٧١.

١٤- « لاَ إلهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَريكَ لَهُ. لَهُ المُلْكُ ولَهُ الحَمْدُ. وهوَ على كُلِّ شَيءٍ قَديرٌ »(دە)جار[٧٥]. یان (یەك جار لە كاتی بەیانیدا)[٧٦].

**واتە: هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لە (الله) تاكی بێهاوبەشە، موڵك و سوپاس هەر بۆ ئەوە و بەسەر هەموو شتێكدا بەتوانایە.**

١٥- « سُبحانَ اللهِ وبِحَمدِهِ: عَدَدَ خَلْقِهِ. ورِضا نَفْسِهِ. وزِنَةَ عَرْشِهِ. ومِدادَ كَلِماتِهِ »(تەنها بەیانیان سێ جار).[٧٧]

---

(٧٥) (هەركەسێك (دە)جار دوای نوێژی بەیانی بڵێت لەو (دە)جارەكەی بۆ دەنووسرێ و (دە) خراپەی لەسەر لادەچێ و (دە) پلە بەرز دەبێتەوە. وە بەئەندازەی رزگاركردنی دوو كۆیلە لەنەوەكانی ئیسماعیل پێغەمبەر (علیه الصلاة و السلام) چاكەی دەكات. وە ئێوارەیش بیڵێ هەروەهایە. وە دەبێتە پارێزەری بۆی لە شەیطان تاكو رۆژی لێ دەبێتەوە). النسائي في عمل اليوم والليلة برقم (٢٤) وانظر: صحيح الترغيب والترهيب ١/٢٧٢ وتحفة الأخيار لابن باز ص (٤٤) ورواه الخطيب في تاريخ (١٢/٧٢ و٢٨٩) وقال العلامة الألباني في (سلسلة الصحيحة) رقم (١١٣): وهذا إسناد صحيح رجاله ثقات رجال مسلم غير قران هذا وهو ثقة. ا. هـ

(٧٦) (هەركەسێك بەیانیان (یەك) جار بیڵێ خوای گەورە بەئەندازەی ئەو كەسە خێری بۆدەنووسێ كە بەندەیەكی رزگاركردبێ لەنەوەكانی ئیسماعیل پێغەمبەر (علیه الصلاة و السلام)، و(دە)خراپەی لەسەر لادەبات و(دە)پلە بەرزی دەكاتەوە و پارێزراو دەبێ لە شەیطان هەتا ئێوارەی لێ دەبێتەوە. وە ئەگەر ئێوارە بیڵێ بەو جۆرەیە هەتا بەیانی لێ دەبێتەوە). ابوداود ٤/ ٣١٩ وابن ماجه واحمد ٤/٦٠ وانظر صحيح الترغيب والترهيب ١/٢٧٠ وصحيح ابوداود ٣/٩٥٧. وصحيح ابن ماجه ٢/ ٣٣١ وزاد المعاد ٢/٣٧٧.

(٧٧) مسلم ٤/٢٠٩٠.

واتە: پاکیو بێ کەم و کوڕتیو گەورەیی سوپاس بۆخوای گەورە: بە ئەندازەی ژمارەی دروستکراوەکانیو ڕەزای خۆیو قورساییو سەنگینی عەرشەکەیو زۆرو درێژی ووشەکانی.

١٦-« أعوذُ بِكَلِماتِ اللهِ التَامَات مِنْ شَرِّ ما خَلَــقَ » سێ جار تەنها ئێواران.(٧٨)

واتە: پەنا ئەگرم بە ووشە تەواوەکانی خوای گەورە لە خراپەی دروست کراوەکانی.

---

(٧٨) هەرکەسێ ئێواران سێ جار بیڵێ ئەوا ئەو شەوە پێوەدان زیانی پێ ناگەیەنێ/اخرجه احمد ٢/ ٢٩٠. والنسائي في عمل اليوم والليلة برقم (٥٩٠) وابن السني برقم (٦٨) وانظرصحيح الترمذي٣/٢٨٧. وصحيح ابن ماجه ٢/٢٦٦ وتحفةالاخيار ص(٤٥).

# خواردن و خواردنەوە

پێش خواردن بڵێ(بسم الله) . واتە: بە ناوی خوا. بەڵام ئەگەر بیرت چوو ئەوا هەرکاتێ بیرت کەوتەوە بڵێ: «بسم الله في أوله وآخره»

واتە: بە ناوی خوای گەورە لە سەرەتاو کۆتاییدا.

یان پێش خواردن بڵێ: «اللهم بارك لنا فيه وأطعمنا خيرا منه».

واتە: خوایە بەرەکەت بڕژە بەسەرماندا لەمەدوا لەم خواردنە چاکترمان بدەرێ.

بەڵام ئەگەر شیرت خواردەوە لە سەرەتادا بڵێ: «اَللّهُمَّ بارِكْ لَنا فيه وَزِدنا مِنهُ».[81]

واتە: خوایە بەرەکەت بڕژە بە سەرمان دا لەمەدوا لەمەمان بۆ زیاد بکە.

( وە بە دەستی ڕاستت و لەبەردەمی خۆتەوە بخۆ ).[82]

(وە بەسێ پەنجەی گەورەو شایەتمان و ناوەڕاست بخۆو دوایی [ پێش دەست سڕین ] هەرسێکیان بلێسەرەوە).[83]

---

(80) أخرجه ابوداود 3/347 والترمذي 4/288 وانظر صحيح الترمذي 2/167.

(81) الترمذي 5/ 506 وانظر صحيح الترمذي 2/ 158. چونکە لە شیر چاکتر نییە.

(82) البخاري 9/458 ومسلم (2022).

(83) مسلم (2032). چونکە پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێش دەست سڕین هەرسێ پەنجەکانی دەلێسایەوە.

وە (ئاپەکەش بلێسەرەوەو هەرچییەکت لەدەست کەوتە خوارەوە لە پاروو هەڵی بگرەوەو پاکی بکەرەوەو بیخۆو فڕێی مەدە بۆ شەیطان).[84]

وە ( بــــە پێــــوە خواردنــــەوەو خــــواردن قــــەدەغەیە).[85]

وە (بە پاڵکشانیشەوە خواردن مەخۆ).[86]

وە کە تەواو بوویت و لێ بوویتەوە بڵێ: (( الحَمدُ لله الّذي أطعَمَني هــذا وَرَزَقَنيه مِن غَيرِ حَولٍ مِنّي وَلا قُوّة )).[87]

---

(84) مسلم (2034).

(85) مسلم (2024) – (113). بەڵام شت خواردن بەدەم پیاسەوە بە پێویستەوە درووستە هاوەڵەکان(رەزای خوای گەورەیان لێ بێت) کردوویانە/ رواه الترمذي(1881) وقـال: حـديث حسـن صـحيح عـن إبـن عمـر(رضـي الله عنهمـا) هەرچەندە لەوانەیە(عورفەن) هەندێ ناوچە بە جوانی نەزانن.

(86) چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (( لا آكُـلُ مُتّكِـاً )) رواه البخاري(9/472).
ئیمامی الخطابي دەفەرموێت: مەبەست بە(المُتّكي)لێرەدا پاڵدانەوەیە لە دانیشتن لەسەر پارچە نوێنێک و شتی لەو. وە مەبەستی ئەوەیە کەوا لەسەر ئەو پارچە قوماشانە دانانیشێ وەکو کەسێک بیەوێ زۆر بخوات بە ئیسراحەت، بەڵکو بە شێوەیەکی لەسەر پەلەیی دادەنیشێ و بە پێی پێویست دەخوات. ئەمە وتەی(الخطابي)یە. وە هەندێ ئەوەیش ئاماژە دەکەن بەوەی کە(المُتّكي): ئەو کەسەیە کە پاڵکەوتوو لەسەر تەنیشتی کەوتووە. والله أعلم/ بڕوانە رياض الصالحين(ص/265).

(87) هەرکەسێ ئەمە بڵێ خوا لە گوناهەکانی ئەوە پێشی خۆش دەبێ/ أخرجه أصحاب السنن الأربع إلا النسائي وانظر صحيح الترمذي 3/159. وصحيح سنن ابي داود 3/760 وهو حديث حسن.
بەڵام وتە ئێمیەتییەکە فەرموودەی: (( الحَمدُ لِله الّذي أطعَمَنا وَسَقانا وَجَعَلَنا مُسلِمينَ )) فەرموودەیەکی ضەعیفە( بڕوانە تخريج الكلم الطيب لاپەرە 188).

واتە: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئەم خواردنەی دامێو پێی و پێدای دام بە بێ کۆشان و توانای خۆم.

یان بڵێ:

« الحمدُ لله حمداً كثيراً طيباً مباركاً فيهِ غير مَكفيٍّ ولا مُوَدَّعٍ ولا مُستغنىً عنهُ ربنا »[٨٨]

واتە: سوپاس و ستایش بۆ خوا، ستایشێکی زۆری پاکی پیرۆز بێ، خوای گەورە بەسمانەو ولازمان لێ نەهێنراوەو وەلا نەنراوین و کەس نییە بێنیاز بێ لێی پەروەردگارمان.

یان بڵێ: « الحمد لله الذي أطعمَ وسَقى وسَوّغهُ وجعَلَ لهُ مَخرجاً »[٨٩]

واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە خواردنی داینێ‌و تێرئاوی کردین و دابەزاندنی خواردنەکەی ئاسان کردووە لە گەرووداو دەرچەی بۆ داناوە.

یان بڵێ: « اللهمّ أطعمتَ وأسقيتَ وأقنيتَ. وهديتَ وأحييتَ. فلكَ الحمدُ على ما أعطيتَ »[٩٠]

واتە: خوایە تۆ خواردن و خواردنەت داوەو ماڵ و هەموو شتێکی ترت بەخشیوەو هیدایەتت داوەو ژیاندووتە. سا ستایش و سوپاس بۆ تۆیە لەسەر ئەوەی کە بەخشیوتە.

---

(٨٨) البخاري ٦/٢١٤ والترمذي بلفظه ٥/ ٥٠٧. وفي رواية: « الحمدُ لله الذي كفانا وأروانا غيرَ مكفيٍّ ولا مكفور » رواه البخاري (٥٤٥٩).

(٨٩) رواه أبو داود(٣٨٥١) وصححه الألباني انظر(صحيح سنن أبي داود ٢/٧٣٠).

(٩٠) رواه أحمد وصححه الالباني: سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم (١٧).

( وە ئەگەر ئاو یان شیرت خواردەوە بە دانیشتنەوە بیخۆرەوە).[٩١]

وە(هەناسەی لەسەر مەدەو فووی لێ مەکە).[٩٢] وە (سێ هەناسە بدە لە دەرەوەی جامەکە لە کاتی خواردنەوەدا).[٩٣]

وە ئەگەر یەکێک ئاوی دایتێ یان ویستی ئاوت بداتێ بڵێ:

« اللهمّ أطعِمْ من أطعَمَني وأسقِ من سَقاني ».[٩٤]

واتە: خوایە خواردن بدە بەو کەسەی خواردنی دامێ و ئەو کەسە تێر ئاو بکە کە ئاوی دامێ.

وە( ئەو کەسەی کە ئاو دەگێڕێت با خۆی کۆتا کەس بیخواتەوە).[٩٥] وە( ئەگەر حەزت لە خواردنێک نەبوو عەیبی لێ مەگرەو یان بیخۆ یان وازی لێ بێنە).[٩٦]

---

(٩١) مسلم (٢٠٢٤) – (١١٣).

(٩٢) الترمذي (١٨٨٩) وقال: حديث حسن صحيح، وأخرجه أبو داود (٣٧٢٨) وابن ماجه (٣٤٢٨) وإسناده صحيح عن ابن عباس (رضي الله عنهما).

(٩٣) البخاري ٨١/١٠ ومسلم (٢٠٢٨).

(٩٤) مسلم ١٢٦/٣.

(٩٥) الترمذي (١٨٩٥) وقال: حديث حسن صحيح. وأخرجه مسلم (٦٨١) في حديث مطول.

(٩٦) چونکە پێغەمبەر(ﷺ) هەرگیز عەیبی لە خواردن نەگرتووە/ البخاري ٤٧٧/٩ ومسلم (٢٠٦٤).

(لە کاتی ئاوو شیر گێڕاندا لە لای ڕاستەوەی خۆتەوە دەست پێ بکە). [٩٧]

( ئادەمیزاد هیچ دەفرێکی پڕ نەکردووە لە ووڕگی خراپتر بێت، وە چەند پارووێك بەسە بۆ مرۆڤ کە پشتی ڕاگیر بکات ئەگەر نا با سێ یەکی گەدەی دابنێ بۆ خواردن و سێ یەکی بۆ خواردنەوەو سێ یەکی بۆ هەناسە). [٩٨]

( وە ئەگەر مێشکێك کەوتە ناو خواردنەوەی یەکێکتانەوە با هەمووی نوقم بکات و دەری بهێنێتەوە تیادا. چونکە لە باڵێکیدا دەردو لە باڵەکەی تریدا دەرمان هەیە). [٩٩]

تێبینی: دەست نوێژگرتن پێش نان خواردن سوننەتە بۆ کەسی لەش گران. [١٠٠]

---

(٩٧)البخاري ٥/ ١٤٨ و ١٠/ ٦٦ ومسلم (٢٠٢٩).

(٩٨)رواه الامام احمد والترمذي(٢٣٨١) والنسائي وابن ماجه وقال الترمذي: حديث حسن، عن المقدام بن معد يكرب (ﷺ) انظر اربعين النووية.

(٩٩)اخرجه البخاري والدارمي وابن ماجه وآخرون والزيادة للبخاري. انظر سلسلة الاحاديث الصحيحة رقم (٣٨).

(١٠٠)رواه ابوداود ١/٢٧٥/٢٢٢ وانظر سلسلة الاحاديث الصحيحة(١/٦٧٤) رقم الحديث(٣٩٠).

## دوعا و پاڕانەوەی میوان بۆ خاوەن ماڵ

« اللَّهُمَّ بَارِكْ لَهُمْ فِيمَا رَزَقْتَهُمْ وَاغْفِرْ لَهُمْ وَارْحَمْهُمْ » [101]

**واتە: خوایە بەرەکەت بخەرە ئەو ڕۆزییەی داوتنەتێ و لێیان خۆش بەو بەزەییت پێیان دا بێتەوە.**

## لە کاتی بینینی نۆبەرەی میوەدا

« اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي ثَمَرِنَا، وَبَارِكْ لَنَا فِي مَدِينَتِنَا، وَبَارِكْ لَنَا فِي صَاعِنَا، وَبَارِكْ لَنَا فِي مُدِّنَا » [102]

**واتە: خوایە بەرەکەت بخەیتە ناو میوەمانەوەو بەرەکەت بخەرە شارەکەمانەوەو بەرەکەت بخەرە ئەفری (صاع)مانەوە(کە چوار مشت دەگرێت)و بەرەکەت بخەرە ناو (مُدّ)واتە مشتمانەوە.**

## داماڵین و داکەندنی پۆشاك و جل

**( پەردەی نێوان چاوی جنۆکەو داوێن(عەورەتی) ئادەمیزاد ئەوەیە کە کاتێ یەکێکیان پۆشاکی دانا بڵێ (بسم الله) [103]**

---

(١٠١)مسلم ٣/١٦١٥.

(١٠٢)ئەوە پاشان دەیدات بە بچووکترین منداڵ لەو خێزانەدا/ مسلم ٢/١٠٠٠.

(١٠٣)رواه الطبراني في الأوسط وصحّحهُ الألباني(صحيح الجامع ٣/٢٠٣)

# چوونه سەر ئاو

له پێش چوونه ژوورەوه بڵێ: «[بسم الله] اللهُمَّ إني أعوذ بك من الخُبْثِ والخبائث»(١٠٤)

واته: بەناوی خوا، خوایه پەنات پێ ئەگرم له شەیطانه نێرومێیەكان.

وه كه هاتیته دەرەوه بڵێ: «غفرانك»(١٠٥)

واته: خوایه لێم خۆش به - ماوەیەكه یادی تۆم نەكرد-.

<u>تێبینی</u>: زانایان پێیان وایه چاك وایه له پێش دا قاچی چەپ پێش بخرێت بۆ چوونه ژوورەوەو قاچی ڕاستیش پێش بخرێت بۆ هاتنه دەرەوه.

---

(١٠٤) أخرجه البخاري ١/٤٥ ومسلم ١/٢٨٢ (الخُبْث) به سكوني سەر (باء)ەكەش به ضەممەش دەخوێنرێتەوه. وه زیادەی (بسم الله)ش لەسەرەوەیدا نوێیه بەڵكو أخرجها سعيد بن منصور، (انظر الفتح الباري ١/٢٤٤) وەپێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (پەردەی نێوان چاوی جنۆكەو عەورەتی ئادەمیزاد ئەوەیه كه كاتێ چووه سەر ئاو بڵێ (بسم الله) رواه الطبراني في الأوسط وصححه الألباني (صحيح الجامع ٣/٢٠٣)

(١٠٥) أبوداود ١/٣٠ رقم (٣٠) والترمذي ١/١٢ رقم (٧) وقال: حديث حسن غريب، وابن ماجه ١/١١٠ رقم (٣٠٠). وصحّحَهُ الألباني في صحيح أبي داود برقم(٢٢).

## جل و بەرگ لەبەر كردن

له پێش دا لای ڕاست لەبەر بكە،(١٠٦) وە بڵێ « الحمد لله الذي كساني هذا ورزقنيه من غير حول مني ولا قوة ».(١٠٧)

واته: ستایش بۆ ئەو خوایەی كە ئەم پۆشاكەی پۆشیم و پێی بەخشیم بە بێ هیچ گۆڕان و توانای خۆم.

## لەبەر كردن و پۆشینی جل و بەرگی نوێ

« اللهمَّ لكَ الحمدُ، أنتَ كسوتنيه، أسألكَ مِنْ خيرِه وخيرِ ما صُنِعَ لهُ، وأعوذُ بكَ مِنْ شرِّهِ وشرِّ ما صُنِعَ لهُ ».(١٠٨)

واته: خوایه ستایش بۆ تۆیه تۆ پۆشیمت و پۆشتەت كردم، داوای چاكەی ئەم پۆشاكەت لێ ئەكەم( كە بریتییە لە مانەوە لە ژیاندا) وە داوای ئەو خێرو چاكەیەت لێ ئەكەم كە بۆی دروست كراوە( كە بریتییە لە لادانی بەلای ئەو كارەدا كە ڕەزامەندی خوای گەورەی تیایە)، وە پەنات پێ ئەگرم لە خراپەی‌و ئەو خراپەیەی بۆیی دروست كراوە( كە بریتییە لە لادانی بە لای ئەوەی بە خۆ بەزل زانین و فیزەوە لەبەری بكات).

---

(١٠٦) أبوداود (٤١٤١) وسنده صحيح وأخرجه الترمذي (١٧٦٦) وصححه ابن حبان (١٤٧). وهو حديث صحيح. انظر زاد المعاد ٢/٢٨٧ وصحيح الترمذي ٥/١

(١٠٧)(هەركەسێك ئەمە بڵێ خوای گەورە لە تاوانەكانی پێشووی خۆش دەبێ/ أخرجه أهل السنن إلا النسائي انظر إرواء الغليل ٧/٤٧ هذا حديث حسن. وانظر(صحيح أبي داود ٢/٧٦٠) .

(١٠٨) أبو داود ٤/ ١٢ وانظر صحيح الترمذي ٢/١٧١. وهو حديث حسن. وانظر مختصر شمائل الترمذي للألباني ص/٤٧.

## ئەگەر یەکێك بەرگی نوێی لەبەرکردبوو

١- پێی بڵێ: « تُبلي وَيُخلِفُ اللهُ تعالى ».[١٠٩]

واتە: یاخوا بیڕزێنیت (ئەوەندە لەش ساغ و تەمەن درێژ بیت ئەو بیدڕێنیت) وە خوای گەورە پۆشاکی تر بخاتەوە شوێنی.

٢- « إلبس جَديداً. وَعِشْ حَميداً. وَمُتْ شهيداً ».[١١٠]

واتە: یاخوا پۆشاکی تازە لەبەر بکەیت و بە سوپاس کراوی و بژیت و بە شەهیدی سەربنێیتەوە و بمریت.

## لە پێکردنی نەعل و پێڵاو

لە پێشدا لای ڕاست لە پێ بکەو لە کاتی داکەندندا لای چەپ دابکەنە.[١١١]

---

(١٠٩)أخرجه أبوداود (٤١/٤)برقم(٤٠٢٠) وانظر صحيح ابي داود٢/٧٦٠ وسنده صحيح، ئەمە ووتەی هاوەڵەکانی پێغەمبەرە (ﷺ)کە بە یەکتریان فەرموو ئەوەشیان لە وتەی پێغەمبەر (ﷺ)ەوە وەرگرتووە بە لەفزی: (ابلي و اخلقي)یەعنی ڕاستکراوە بە (واخلقي)ە(فاء) دوو یان سێ جار بیڵێ/ واخرجه البخاري كتاب الجهاد ١٨٨ واللباس ٢٢ والادب ١٧.

(١١٠)ابن ماجه ٢/١١٧٨ والبغوي ٤١/١٢ وانظر صحيح ابن ماجه ٢/٢٧٥. وهو صحيح.

(١١١)البخاري ٣٦٢/١٠ ومسلم (٢٠٩٧).

وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەهی کردووە لە لەپێ کردنی نەعل بە پێوە.[112] وە بە یەك تاكەوە مەڕۆ بە ڕێدا. یان هەردووكی لە پێ بكە یان هەردووكیان دابكەنە.[113]

# چوونە دەرەوە لەماڵ

١- (( بسم الله، توكلت على الله، لا حول ولا قوة إلا بالله )).[114]

**واتە: بە ناوی خوا پشتم بەخوای گەورە بەست و هیچ گۆڕان و توانایەك نی‌یە مەگەر بەخوای گەورەوە.**

---

(١١٢) ابوداود (٤١٢٥) بإسنادٍ حَسَنٍ عن جابر ورجاله ثقات وهو حديث صحيح بشواهده عن أبي هريرة وعبدالله بن عمر وأنس (رضي الله عنهم).

تێبینی:

ئیمامی (المناوي) دەفەرموێت: فەرموودەكە بۆ پێ ئیشاندان و ئەوشانە. چونكە بە دانیشتنەوە لە پێ كردنی ئاسان ترە. بۆیە ئیمامی (الطِّيبي) وە غەیری ئەو نەهی‌یەكەیان تایبەت كردووە بە لەپێ كردنی ئەو پێڵاوەی كە لە پێ كردنی بە پێوە ئارەحەتەوەو ماندووت دەكات وەكو (ناسومە و خوف) (كە ئێستاكانی هەیە) نەك (قابقاب و سەرموزە ) وە خوای گەورەش زاناترە بە حیكمەتی تەشریع و نەهی‌یەكانی/بڕوانە سلسلة الصحيحة للألباني (٣٥٠/٢).

(١١٣) البخاري ١٠/ ٢٦٢، ١٦١ ومسلم (٢٠٩٧).

(١١٤) (ئەگەر لە ماڵ دەرچێت و ئەمە بڵێ ئەوا پێی دەوترێت: هیدایەت درایت و كیفایەت كرایت و پارێزرایت، وە شەیطانی لێ دوور دەخرێتەوە. وە شەیطانێكی تر دەڵێ: تۆ چ دەستەلاتێكت هەیە بەسەر كەسێك دا كە هیدایەت درابێت و كیفایەت كرابێت و پارێزرابێت/ رواه أبوداود ٤/ ٣٢٥ رقم (٥٠٩٥) و الترمذي رقم (٣٤٢٦) وصحّحهُ الألباني في صحيح الجامع برقم (٦٤١٩) وانظر صحيح الترمذي ٣/ ١٥١.

٢- «اللهُمَّ إنّي أعوذُ بِكَ أن أضِلَّ أو أُضَلَّ. أو أزِلَّ أو أُزَلَّ. أو أظلِمَ أو أُظلَم. أو أجهَلَ أو يُجْهَلَ عَلَيَّ». (١١٥)

واتە: خوایە پەنات پێ ئەگرم لەوەی خەڵك گومڕا بكەم یان گومڕا بكرێم. یان هەڵە بكەم یان هەڵەم لەگەڵ بكرێ، یان ستەم بكەم یان ستەمم لێ بكرێ. یان نەفامی بكەم یان نەفامیم لەگەڵ دا بكرێ.

# گەڕانەوە بۆ ماڵ

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فإذا دَخَلتُم بُيُوتاً فَسَلِّموا على أنفُسِكُم تَحيَّةً منْ عِندِ اللهِ مُبارَكةً طَيِّبةً.. ﴾ (النور:٦١)

واتە: ئەگەر چوونە ماڵێكەوە سڵاو لە یەكتری‌و خۆتان بكەن بەسڵاوێكی خوایی پیرۆزو بەفەڕو پاك. (١١٦)

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: «سێ كەس هەموویان مسۆگەر زامنن لە ژێر چاودێری خوای گەورەدان...» وە لەوانە: «رجُلٌ دَخَلَ بَيتَهُ بِسَلامٍ فَهوَ ضامِنٌ على اللهِ عزَّ وَجلَّ». (١١٧)

---

(١١٥) المرجئة لفل السنن وانظر صحيح الترمذي ٣/١٥٢ وصحيح ابن ماجه ٢/٣٣٦.

(١١٦) تفسير القرآن العظيم ٣/٢٧٠ -٢٧١.

(١١٧) صحيح (صحيح سنن أبي داود ٢/٤٧٢) وە لەفەرموودەی صەحیح دا هاتووە: (ئەگەر پیاوێك گەڕایەوە ماڵەوەو یادی خوای گەورە كرد لەكاتی چوونە ژوورەوەو نان خواردنیدا. ئەوا شەیطان بەهاوەڵەكانی دەڵێت: لێرە نەجێگەی نەشێوو خواردنتان نییە) مسلم ژمارە (٢٠١٨).

واته: پیارێك بگەڕێتەوە ماڵەوە بە سلاو كردن زامنە لەلایەن خواوە.

وە عائیشە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر بگەڕایەتەوە ماڵەوە بە سیواك دەستی پێ دەكرد- واته: یەكەم شت سیواكی دەكرد-. [118]

## لە كاتی ڕۆیشتن دا بەرەو مزگەوت

«اللَّهُمَّ اجعلْ في قلبي نوراً، وفي لساني نوراً، وفي سمعي نوراً، وفي بصري نوراً، ومن فوقي نوراً، ومن تحتي نوراً، وعن يميني نوراً، وعن شمالي نوراً، ومن أمامي نوراً، ومن خلفي نوراً، واجعل في نفسي نوراً، وأعظم لي نوراً، وعظِّم لي نوراً، واجعل لي نوراً، واجعلني نوراً، اللهمَّ أعطني نوراً، واجعل في عصبي نوراً، وفي لحمي نوراً، وفي دمي نوراً، وفي شعري نوراً، وفي بشري نوراً» [119]
«وزدني نوراً، وزدني نوراً، وزدني نوراً» [120]

(118) صحيح مسلم / كتاب الطهارة باب 15، رقم (44).

(119) هەموو ئەم حاڵەتە هاتووە لە البخاري 116/11، رقم 6316 ومسلم 526/1، 529،530 برقم 763

(120) أخرجه البخاري في الأدب المفرد برقم 695 ص 258 وصحَّح إسنادَهُ الألباني في صحيح الأدب المفرد برقم 536.

« وهبْ لي نوراً على نور » [١٢١]

واته: خوايه لەدڵم دا نور بەرپابكەی، وە لە زوبانم و بيستن و بينين و سەرەوەو خوارەوەم و ڕاست و چەپم و پێشەوەو پاشەوەمو لەدەروونمـدا، وە نـورم بـۆ گەورەبكـەيت و نـورم تيا گەورەبكەيت و نورم بۆ بكەيت و بمكەيتە نور. خوايە نورم پێ ببەخشی و لەئەمارەمـدا نـورم بـدەيتێ. وە لـە گۆشـت و خـوێن و موو پێستمدا. وەنورم بۆ زياد بكە – سێ جار – وەنور لەسەر نورم پێ ببەخشە.

يان به كورتی بڵێ:

« اَللّٰهُمَّ اجعَلْ فِي قَلبِـي نوراً، وفي لسـاني نـوراً، وَاجعَـلْ فِي سَمعي نُوراً. وَاجعَلْ فِي بصري نوراً واجعلْ مِنْ خَلفِي نُـوراً. وَمِنْ أمامي نُوراً. واجعل من فوقي نوراً ومِنْ تحتي نوراً.اللّـهُمَّ أعطِنِي نوراً ». [١٢٢]

واته: خوايه نور بخەيته دڵ و زوبان و بيستن و بينين و پاش و پێش و سەرو خوارەوەم. ئەی خوايە نورم پێ ببەخشی.

---

[١٢١] ابن حجر هێناويەتی لە(فتح الباري)دا و دەڵێت ڕاڵ ابن ابی عاصم لە(كتاب الدعاء). بڕوانە(الفتح ١١/١١٨). وە فەرموويەتی: لە كۆی جياوازی ڕيوايەتەكانەوە بيست و پێنج خاڵ هاتووە.

[١٢٢] رواه مسلم ٦/٥١ وابن خزيمة في صحيحه(٤٤٨).

# چوونە ناو مزگەوت

«أعوذُ باللهِ العظيمِ وَبِوَجهِهِ الكَريمِ. وَسُلطانِهِ القَديمِ. مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيمِ»[١٢٣] «بِسمِ اللهِ والصَّلاةُ»[١٢٤] «والسَّلامُ عَلَى رَسُولِ اللهِ»[١٢٥] «اللهُمَّ افتَحْ لِي أبوابَ رَحمَتِكَ».[١٢٦]

واتە: پەنا ئەگرم بەخوای گەورەو بە ڕووی بەڕێزی و دەسەڵاتی هەربووی بەردەوامی لە شەیطانی نەفرەت لێ کراوی لە ڕەحمەت دەرکراو. بەناوی خوای گەورەو درودو سڵاو لەسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ). خوایە دەرگاکانی ڕەحمەتی خۆتم لێ بکەرەوە.

# هاتنە دەرەوە لە مزگەوت

«بِسمِ اللهِ. والصَّلاةُ والسَّلامُ عَلَى رَسُولِ اللهِ. اللهُمَّ إنِّي أسأَلُكَ مِنْ فَضلِكَ. اللهُمَّ اعصِمْني مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيمِ».[١٢٧]

---

(١٢٣) ئەگەر ئەمە بڵێ شەیطان دەڵێ: پەروەردگاری هەموو ڕۆژەکە پارێزراوە لێم / حديث صحيح (انظر صحيح سنن ابي داود ١/٩٣) وانظر صحيح الجامع برقم ٤٥٩١.

(١٢٤) رواه ابن السني برقم (٨٨) وحسّنهُ الألباني.

(١٢٥) ابوداود ١/١٢٦ وانظر صحيح الجامع ١/٥٢٨.

(١٢٦) مسلم ١/٤٩٤.

(١٢٧) بڕوانە تەخریجی ریوایەتەکانی فەرموودەی چوونە ناو مزگەوت لە پەراوێزی ژمارە(٦٤)دا. وە زیادەی: «اللهُمَّ اعصِمني مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيمِ» لابن ماجه وهو صحيح. انظر صحيح ابن ماجه ١/١٢٩.

واته: بەناوی خوا، دروودو سڵاو لەسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) خوایە من داوای فەزڵی خۆتت لێ دەکەم. خوایە بمپارێزە لە شەیطانی نەفرەت لێ کراو.

تێبینی بۆ چوونە مزگەوت قاچی ڕاست پێش دەخرێت. بەڵام بۆ هاتنە دەرەوە قاچی چەپ پێش دەخرێت.

## بینینی ئەو کردەوانەی کە لە مزگەوتدا دروست نین

ئەگەر کەسێک لە مزگەوتدا جاڕی بۆ شتێکی ون بوو ئەدا پێی بڵێ: ((لا رَدَّها اللهُ عليك))

واتە: خوا بۆت نەگەڕێنێتەوە.

وە ئەگەر بینیت کڕین و فرۆشتن دەکرا لە مزگەوتدا پێی بڵێ: ((لا أربح الله تجارتك)).(١٢٨)

واتە: خوای گەورە قازانج نەخاتە ناو ئەو بازرگانییەتەوە، چونکە مزگەوت بۆ ئەوە نەکراوە.

وەدروست نییە تف و بەڵغەم و چڵم و شتی پیس پڕیکرێتە ناو مزگەوت چونکە تاوانە کەفارەتەکەشی پاک کردنەوەیەتی (١٢٩)

---

(١٢٨) الترمذي (١٣٢١) وقال حديث حسن. والدارمي ٣٢٦/١ وصحَّحَهُ ابن حبان (١١٣) والحاكم ٥٦/٢ ووافقه الذهبي عن ابوهريرة (ﷺ)

(١٢٩) البخاري ٤٢٨/١ ومسلم (٥٢٢).

وە نەهی کراوە لەوەی کە شیعری ناجاهیلی تێدا بووترێت.[١٣٠] وە هەروەها دروست نییە دەنگ بەرز کردنەوە تیایدا.[١٣١] وە هەر کەسێک پیاز یان سیر یان کەوەر (یان تووړ یان شتی بۆن ناخۆشی تری خواردبێت) با نزیکی مزگەوت نەکەوێتەوە. چونکە مەلائیکەتەکان ئەزیەت ئەچێژن بەو شتەی کە مرۆڤ ئەزیەتی پێ دەگا.[١٣٢]

## پێش دەست نوێژ

بڵێ: ( بسم الله ) [١٣٣]

تێبینی: ئەو ویردو زیکرانەی خەڵکی عەوام دەیڵێن لە کاتی شۆردنی هەر ئەندامێک لە ئەندامەکانی دەست نوێژدا هیچ بنچینەیەکی نییەو لە فەرموودەدا نەهاتووە.[١٣٤] وە هیچ دوعاو نزایەکی تایبەتیش نییە بە کاتی دەست نوێژ شتنەوە.

---

(١٣٠) ابوداود (١٠٧٩) والترمذي (٣٢٢) وقال حديث حسن. واخرجه النسائي ٤٧/٢ – ٤٨ وسنده حسن، عن عمرو بن شعيب عن ابيه عن جده (رضي الله عنه).

(١٣١) البخاري ٦٥/٧.

(١٣٢) البخاري ٤٩٨/٩ ومسلم (٥٦٤).

(١٣٣) ابوداود ٧٥/١ رقم (١٠١) وابن ماجه ١٤٠/١ رقم (٣٩٩) وغيرهم عن ابي هريرة. وفي سنده مجهولان: يعقوب بن سلمة وابوه ولكن الحديث حسن بمجموع طرقه.. والله اعلم. وانظر ارواء الغليل ١٢٢/١. و(صحيح الترمذي ١٠/١).

(١٣٤) انظر الوابل الصيب ص(٣١٦) والاذكار للنووي ١١٦/١.

## نزای دوای دەست نوێژ

١- «أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله» (١٢٥)

**واتە: شایەتی ئەدەم کە هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لە اللە تاکی بێهاوبەشە. وە شایەتی ئەدەم کە محمد (ﷺ) بەندەو نێردراوی خوایە.**

٢- «اللَّهُمَّ اجعلني من التَّوَّابين واجعلني من المتطهِّرين» (١٣٦)

**واتە: خوایە بمکێیە لە تەوبەکاران و بمکێیە لە خۆپاك کەرەوەکان.**

٣- «سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله إلا أنت أستغفرك وأتوب إليك» (١٣٧)

**واتە: پاکی و بێگەردی و سوپاس بۆ تۆیە خوایە، شایەتی ئەدەم کەهیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لەتۆ، داوای لێخۆش بوونت لێ ئەکەم و ئەگەڕێمەوە بۆ لات.**

---

(١٢٥) هەرکەسێك دەست نوێژی تەواو بگرێت و ئەمە بڵێ هەر هەشت دەرگاکەی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە لەکامیانەوە ئارەزوو بکات دەچێتە ناوی/ مسلم ٢٠٩/١.

(١٣٦) الترمذي ٧٨/١ رقم(٥٥) وانظر صحيح الترمذي ١٨/١ وهو صحيح. صَحَّحَهُ الألباني في سنن الترمذي رقم(٤٨).

(١٣٧) هەرکەس دەست نوێژ بگرێ و پاشان ئەمە بڵێ لەلاپەڕەیەکدا بۆی دەنوسرێتەوە، پاشان مۆر دەکرێت بە مۆرێك ناشکێت تا ڕۆژی قیامەت/ رواه الحاكم ٥٦٤/١ وهو صحيح وانظر النسائي في عمل اليوم والليلة ص ١٧٢ وانظر إرواء الغليل ١٢٥/١ و ٩٤/٢ ورواه الحاكم ٥٦٤/١ انظر صحيح الترغيب والترهيب(٢٢٠).

## وەڵام دانەوەی بانگ بێژ

١-بانگ بێژ هەرچییەکی ووت تۆش دەیڵێیتەوە جگە لە ووتنی: (حي على الصلاة – حي على الفلاح) کە دەبێ بڵێی: (لا حول ولا قوة إلا بالله).[١٣٨]

٢- وە بڵێ: (وأنا أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأن محمداً عبده ورسوله رضيت بالله رباً وبمحمد رسولاً وبالإسلام ديناً).[١٣٩]

ئەمە دوای شایەتمانی بانگ بێژ دەوترێت.[١٤٠]

## دوای بانگ

١- دوای وەڵام دانەوەی بانگ بێژ صەڵەوات بدە لەسەر پێغەمبەر (ﷺ).[١٤١]

٢- پاشان بڵێ «اللهم رب هذه الدعوة التامة والصلاة القائمة

---

(١٣٨) هەر کەس ئاوا لە دڵەوە بیڵێ دەچێتە بەهەشتەوە/ البخاري ١٥٢/١ ومسلم ٢٨٨/١.

(١٣٩) هەرکەسێ کە گوێی لە بانگ بێژ بوو بیڵێ خوای گەورە لە گوناهەکانی خۆش دەبێ /مسلم ٢٩٠/١.

(١٤٠) ابن خزيمة ١/ ٢٢٠.

(١٤١) مسلم ١/ ٢٨٨. بۆ شێوازی صەڵەوات بڕوانە لاپەڕە (٨٦-٨٧).

آت محمداً الوسيلة والفضيلة وابعثه مقاماً محموداً الذي وعدته [117]

**واته: خوایه پەروەردگاری ئەم بانگەوازه تەواوو نوێژه دامەزراوه. ببەخشه بە پێغەمبەرمان محمد ﷺ پلەی بەرزی (الوسیلة) (کە شوێنێکە لەبەهەشت دایە بۆ کەس نابێ جگە لەبەندەیەك لەبەندەکانی خوای گەورە، وه پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئومێدم وایە کە ئەو کەسە من بم) وه (الفضیلة) کە پلەیەکی زیادەیە بەسەر دروست کراواندا. وه بیبەره ئەو شوێنە سوپاس کراوەی کە بەڵێنت پێ داوه ( کە پلەی شەفاعەتی گەورەیە لە ڕۆژی دواییدا).**

**٣- بپاڕێرەوە بۆ خۆت لەنێوان بانگ و قامەت دا. چونکە پاڕانەوەی ئەو کاتە ڕەت ناکرێتەوه.** [118]

---

(117) هەر کەسێك ئەم پاڕانەوەیە بڵێ کاتێ بانگ دەبیستێ بەر شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ دەکەوێت البخاري/ ١/١٥٢ وه زیادەی: (إنك لا تخلف الميعاد) للبيهقي ١/٤١٠، وه(العلامة ابن باز) لە(تحفة الاخيار) ص ٣٨ ئیسنادەکەی بەحەسەن داناوه. بەڵام ئەم زیادەیە ضەعیفە هەروەك هاتووە لە الإرواء ١/٢٦٠ وه (الفتح)دا.

(118) رواه البخاري ٨/٢٤٤/٥١٧، وانظر صحيح ابوداود(٤٨٩).

# فەزڵی بانگ وتن

١- بانگ بێژ لە ڕۆژی دوایی‌دا لە هەموو کەسێک گەردن و ملی بەرزو درێژترە.[١٤٤]

٢- وە هەموو شتێک لە مرۆڤ و جنۆکەو شتی تر شایەتی بۆ دەدەن لە ڕۆژی دوایی‌دا.[١٤٥]

٣- وە هەر موسڵمانێک(١٢) ساڵ بانگ بدات( بە بێ بەرتیبەر) ئەوا بەهەشتی بۆ واجب دەبێ‌و بە هەموو بانگێک لە ڕۆژێکدا(٦٠) چاکەو بە هەموو قامەتێک(٣٠) چاکەی دەست گیر دەبێ.[١٤٦]



---

(١٤٤) مسلم ٣٨٧ عن معاوية(ﷺ) .

(١٤٥) البخاري ٢/٧٢، ٧٣.

(١٤٦) حديث حسن. اخرجه ابن ماجه رقم(٧٢٨) والدارقطني والحاكم والبيهقي عن ابن عمر(رضي الله عنه) ، انظر (تخريج الانكار) لابن حجر العسقلاني جزء١/ وصحَّحَهُ الالباني في السلسلة الصحيحة ١٦/١.

## ووتەی پێش نوێژ( إمام ) بۆ نوێژکەران

١- پێش دەست پێکردنی نوێژ و لە کاتی چاک کردنی ریزەکانیان دا دەڵێت: « سَوّوا صُفُوفَكُم فَإنَّ تَسوِيةَ الصُّفُوفِ مِنْ تَمامِ الصَّلاةِ ». (١٤٧)

واتە: ریزەکانتان رێک بخەن چونکە بە راستی رێک و پێکی ریز لە تەواوی نوێژەوەیە.

---

(١٤٧) البخاري ٢/١٧٤ ومسلم (٤٣٣) عن أنس، وە لەریوایەتی البخاری‌دا: « فإنَّ تسويةَ الصُّفوفِ مِنْ إقامةِ الصَّلاةِ » . واتە: رێک و پێکی ریزەکان لە تەواوی و دامەزراوی نوێژەکەوەیە.

تێبینی: ریز رێکخستن بەم جۆرەیە: شان دەدەن لە شانی یەک و پێ و تەنیشتی ئەژنۆ دەدەن لە یەک، چونکە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) وایان دەکرد. انظر(سلسلة الصحيحة ١/٤٠١) والحديث رواه أبو داود(٦٦٦) وابن حبان وأحمد وسندهُ صحيح كما قال الألباني). وە پێویستە ریزی یەکەم تەواو بێت ئەوجا ریزی دووەم دروست بکرێت. وە هەروەها بۆ ریزەکانی تریش بەهەمان شێوە چونکە مەلائیکەکانیش بەم شێوازە دەوەستن لەلای پەروەردگار.

## - له نوێژ و دوای نوێژدا -

## سوننەتی دەست پێکردنی نوێژ( الإستفتاح )

١- « اللَّهُمَّ باعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خطايايَ كَما باعَدْتَ بَيْنَ المَشْرِقِ وَالمَغْرِبِ. اللهُمَّ نَقِّنِي مِنْ خَطايايَ كَما يُنَقَّى الثَّوبُ الأَبيَضُ مِنَ الدَّنَسِ. اللهُمَّ اغْسِلْنِي مِنْ خطايايَ بِالثَّلْجِ وَالماءِ وَالبَرَدِ ». (١٤٨)

واتە: خوایە نێوان منو گوناهەکانم دوور بخەرەوە وەك چۆن رۆژهەڵات و رۆژئاوات لەیەك دوورخستۆتەوە. خوایە لەگوناهەکانم پاکم بکەرەوە هەروەکو چۆن کراسی سپی لەچڵك پاك دەبێتەوە.

خوایە لە گوناهەکانم بمشۆرەوە بە بەفرو بارانو تەرزە.

٢- « سُبحانَكَ اللهُمَّ وبِحَمْدِكَ. وتَبارَكَ اسْمُكَ. وَتَعالى جَدُّكَ. وَلا إلَه غَيرُكَ » (١٤٩)

واتە: خوایە پاکیو بێگەردیو ستایش بۆتۆیە، وە ناوی تۆ پیرۆزەو لەبەر بەرەکەتی زۆرەو دەستەڵاتت گەورەو بڵندەو هیچ پەرستراوێك نییە بەحەق جگە لە تۆ.

٣-« وَجَّهْتُ وَجهيَ لِلَّذي فَطَرَ السَّمواتِ وَالأَرضَ حَنيفاً مُسلِماً وَما أنا مِنَ المُشرِكينَ. إنَّ صَلاتِي وَنُسُكي ومَحيايَ ومَماتِي للهِ رَبِّ العالَمين.

---

(١٤٨) البخاري ١/١٨١ و مسلم ١/٤١٩.

(١٤٩) اخرجه اصحاب السنن الاربعة وانظر صحيح الترمذي ١/٧٧. وصحيح ابن ماجه ١/١٣٥.

لا شريكَ لَهُ وَبِذلكَ أُمِرتُ وَأنا مِنَ المُسلمينَ. اللهم أنتَ المَلِكُ لا إلهَ إلاّأنتَ. أنتَ رَبّي وَأنا عَبْدُكَ. ظَلَمْتُ نَفْسي. وَاعترفْتُ بِذَنبي، فاغفِرْ لي ذنوبي جَميعاً، إنَّهُ لا يَغفِرُ الذُّنوبَ إلاّ أنتَ. وَاهدِني لأحسَنِ الأخلاقِ لا يَهدي لأحسَنِها إلاّ أنتَ وَاصرِفْ عَنّي سَيِّئَها لايَصْرِفُ عَنّي سَيِّئَها إلاّ أنتَ. لَبَّيكَ وسَعْدَيكَ. وَالخَيرُ كُلُّهُ بِيَدَيكَ. والشَّرُّ لَيسَ إلَيكَ. أنا بِكَ وَإلَيكَ. تَبارَكْتَ وَتَعالَيْتَ. أستغفِرُكَ وأتوبُ إليكَ». (١٥٠)

واته: به پاکیو دڵسۆزی ڕووم کرده ئەو خوایەی ئاسمانەکانو زەوی بەدیهێناوەو من لەهاوبەش دانەران نیم. بەڕاستی نوێژو سەربڕینو ژیانو مردنم تەنها بۆ پەروەردگاری جیهانیانەو بەوە فەرمانم پێکراوەو من لەموسڵمانانم. خوایە تۆ پادشایت هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لە تۆ، تۆ پەروەردگارمیو من بەندەی تۆم، ستەمم لەنەفسم کردووەو دان ئەنێم بە گوناهەمدا ساخوایە لەهەموو گوناهەکانم خۆش بە، بەڕاستی جگە لە تۆ کەس لە گوناه خۆش نابێ. وەڕێنمویم بکە بۆ چاکترین ڕەوشت، کەس ڕێنمویی ناکات بۆ چاکترینی ڕەوشت و ئاکار جگە لەتۆ. وە کردەوەی خراپم لێدوور بخەرەوە کەس کردار خراپیم لێدوور ناخاتەوە جگە لەتۆ. خوایە(لبیكَ) واتە: وەڵامی دوای وەڵامم هەیە بۆت لەگوێ ڕایەڵیت دلو (سَعدَيكَ) واتە: شوێن کەوتەی دوای

(١٥٠) اخرجه مسلم ٦/٥٧.

شوێن کەوتەم بۆ دینەکەت، چاکە هەمووی بەدەستی تۆیەو خراپەش نادەمە پاڵ تۆ،وە من بەتۆوە هەمو بەلای تۆ دەگەڕێمەوە. پاکیو بێگەردیو بڵندی بۆ تۆیە. داوای لێخۆش بوونت لێدەکەمو دەگەڕێمەوە بۆلات.

٤- «اللّهُمَّ رَبَّ جبرائيلَ. وَمِيكائيلَ، وَإسرافيلَ. فاطِرَ السَّموات وَالأرضِ. عالِمَ الغَيبِ والشَّهادَةِ. أنتَ تَحكُمُ بَينَ عِبادِكَ فِيما كانوا فِيه يَختلِفونَ. إهدِنِي لِما اختُلِفَ فِيهِ مِنَ الحَقِّ بِإذنِكَ إنَّكَ تَهدي مَن تَشاءُ إلى صِراطٍ مُستَقيم »[١٥١]

واتە: خوایە، پەروەردگاری جبرائیلو میکائیلو ئیسرافیل. بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی. زانای غەیبو ئاشکرا. تۆ حوکم دەکەیت لەنێوان بەندەکانت دا لەو شتەدا کەجیاوازن تیایدا. سارێنمویم بکەی بۆ ئەو حەقەی کەخەڵکی تیایدا جیاوازن بەفیزنی خۆت واتە (دامەزراوم بکە لەسەری). بەڕاستی تۆ ڕێنموویی هەرکەسێك بتەوێ دەیکەیت بۆ سەر ڕێگای ڕاست.

٥- «الحَمدُ لله حَمداً كَثيراً طَيِّباً مُبارَكاً فِيه »[١٥٢]

واتە: سوپاسو ستایش بۆ خوای گەورە سوپاسێکی زۆری پاکی پیرۆزبێ.

---

(١٥١) اخرجه مسلم ١/٥٣٤.

(١٥٢) پیاوێك بەم دوعایە دەستی پێکرد. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بینیم دوازدە مەلائیکەت هەڵپەیان بۆکرد □ کامیان بەرزی بکەنەوە/رواه مسلم ١/٤١٩.

٦- «الله أكبرُ كَبيراً. والحمدُ لله كَثيراً. وَسُبحانَ الله بُكْرَةً وَاصِيلاً»[١٥٢]

واتە: خوا گەورەیە. زۆر سوپاس و ستایش بۆ خوا، وە پاکی و بێگەردی بۆ خوا لەبەیانیان و ئێواران دا.

٧- پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر هەڵبسایە شەونوێژی بکردایە دەیفەرموو: «اللهُمَّ لَكَ الحمْدُ أنْتَ نُور السَّمواتِ والأرض ومَنْ فِيهِنَّ. ولَكَ الحَمْدُ انتَ قَيِّمُ السَّمواتِ والأرضِ وَمَنْ فِيهِنَّ. [وَلَكَ الحَمْدُ أنْتَ رَبُّ السَّمواتِ وَالأرضِ وَمَنْ فِيهِنَّ] [وَلَكَ الحَمْدُ لَكَ مُلْكُ السَّمواتِ وَالأرضِ وَمَنْ فِيهِنَّ] [ وَلَكَ الحَمْدُ أنتَ مَلِكُ السَّمواتِ وَالأرضِ] [وَلَكَ الحَمْدُ] [أنتَ الحَقُّ. وَوَعْدُكَ الحَقُّ. وَقَولُكَ الحَقُّ. ولِقاؤكَ الحَقّ. وَالجَنَّةُ حَقٌّ. وَالنَّارُ حَقٌّ. وَالنَّبِيُّونَ حَقٌّ. وَمُحَمَّدٌ (ﷺ) حَقٌّ. وَالسَّاعَةُ حَقٌّ] [اللهُمَّ لَكَ أسْلَمْتُ. وَعَلَيكَ تَوكَّلْتُ. وَبِكَ آمَنْتُ. وَإليكَ أنَبْتُ. وبِكَ خاصَمْتُ. وَإليكَ حاكَمْتُ. فاغفِرلِي ماقَدَّمْتُ. وَما أخَّرْتُ. وَما أسْرَرْتُ.

---

(١٥٢) له ابن عمرەوە (رضي الله عنهما) فەرمویەتی: (لەکاتێکدا ئێمە نوێژمان دەکرد لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) لەکۆمەڵەکەدا پیاوێك ئەمەی فەرموو... پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی کێبوو ئاواو ئاوای ووت؟ پیاوێك لەکۆمەڵەکە فەرمووی: من بووم ئەی پێغەمبەری خوا. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: سەرم سوڕما لێی دەرگاکانی ئاسمانی بۆ کرانەوە). مسلم ١/٤٢٠.

وَما اعلَنتُ] [اَنتَ الْمُقدِّمُ. وَاَنتَ الْمُؤخِّرُ لا إلهَ إلاّ اَنتَ] [اَنتَ إلهي لا إلهَ إلاّ اَنتَ]». (١٥٤)

واته: خوایه ستایش بۆ تۆیه. تۆ نووری ئاسمانەکان و زەوی‌و هەموو ئەو شتانەی کەتیایدان،وه ستایش بۆ تۆیه تۆ هەڵسوڕێنەری ئاسمانەکان و زەوی‌و هەموو ئەو شتانەی کەتیایدان، ستایش بۆ تۆیه تۆ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی‌و ئەو شتانەی کەتیایدان. ستایش بۆ تۆیه مولّکی ئاسمانەکان و زەوی‌و چی تێدایه هی تۆیه. ستایش بۆ تۆیه تۆ پادشای ئاسمانەکان و زەویت. ستایش بۆ تۆیه. تۆ ڕەوا‌و ڕاستی‌و بەڵێنەکەت ڕاستەو وتەکەت ڕاستەو گەیشتن پێت ڕاستەو بەهەشت ڕاستەو ئاگری دۆزەخ ڕاستەو پێغەمبەران(علیهم الصّلاةُ والسّلام) ڕاستن و محمد(ﷺ) ڕاستەو ڕۆژی دوایی ڕاستە. خوایه تەسلیمی تۆبووم و پشتم بەتۆبەستو ئیمانم بەتۆ هێناوەو گەڕاموه بۆلای تۆو بە پشتیوانی تۆوە بەپەرچی دوژمنانم ئەدەمەوە وە حوکمی کێشەی خۆم و ئەو کەسەی مل نادات بۆ هەق دێنمەوە بۆلای تۆ. سا لەو گوناهانەم خۆش بە کەپێشم خستوەو لەوانەش کەدوام خستووەو ئەوەی بەپەنهانی ئەنجامم داوەو ئەوەی ئاشکرام کردووە. تۆ پێشخەری و تۆ دواخەری‌و هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لەتۆ. تۆ پەرستراوی منی هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لەتۆ.

---

(١٥٤) البخاري مع الفتح ٣/٣و ١١/١١٦و ١٣/٣٧١، ٤٢٣، ٤٦٥ ومسلم مختصراً بنحوه ١/٥٣٢.

# نزای چەمینەوەکان( الركوع )

١- « سُبحانَ رَبِّيَ العَظيم » سێجار. (١٥٥)

واتە: پاکی‌و بێ کەم و کورتی‌و گەورەیی بۆ پەروەردگاری مەزنمە.

٢- « سُبحانَكَ اللهُمَّ رَبَّنا وَبِحَمدِكَ اللهُمَّ اغفِر لي ». (١٥٦)

واتە: پاکی‌و بێ کەم و کورتی‌و گەورەیی بۆ تۆیە پەروەردگارم سوپاس و ستایش لایەقی تۆیە. ساخوایە لێم خۆش بە.

٣- « سُبّوحٌ قُدّوسٌ رَبُّ المَلائِكَةِ وَالرُّوحِ ». (١٥٧)

واتە: خوایە تەسبیحات و پیرۆزی بۆ تۆیە پەروەردگاری مەلائیکەتان و ڕۆح.

٤- « اللهُمَّ لَكَ رَكَعتُ. وَبِكَ آمَنتُ. وَلَكَ أَسلَمتُ. خَشَعَ لَكَ سَمعي وَبَصَري. وَمُخّي. وَعَظْمي. وَعَصَبي. وَما استَقَلَّ بِهِ قَدَمي ». (١٥٨)

واتە: خوایە بۆ تۆ چەمیمەوەو ئیمانم بەتۆ هێناو تەسلیمی تۆ بووم و بیستن و بینینم و مۆخ و ئێسقان و دەمارو هەموو ئەم لاشەیەم کە قاچەکانم هەڵیان گرتووە مل کەچی تۆ بوو.

---

(١٥٥) أخرجه أهل السنن وأحمد. وانظر صحيح الترمذي ١/٨٣. وە زیادەی: « و بِحَمدِهِ » صەحیحە بڕوانە( صفة صلاة النبي(ﷺ) ص/١٣٢) الطبعة الثانية من الجديدة ١٤١٧هـ - ١٩٩٦ م .

(١٥٦) البخاري ١/٩٩ ومسلم ١/٣٥٠.

(١٥٧) مسلم ١/٣٥٣ وأبوداود ١/٢٣٠.

(١٥٨) مسلم ١/٥٣٤ والأربعة إلا ابن ماجه.

هـ- «سُبحانَ ذي الجَبَروتِ. وَالمَلَكوتِ. والكِبرِيآءِ. والعَظَمَةِ». [159]

واته: پاكی و بێ عەیبی بۆ تۆیە ئەی خاوەنی هەموو تەصەڕوفی بێ‌سنووری موڵك و گەورەیی و مەزنی.

## نزای هەستانەوە لە چەمینەوەكان

١- «سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ». [160]

واته: خوای گەورە ستایشی ئەو كەسەی بیست كە ستایشی كرد و سوپاس و پێزانینی بۆ دەربڕیوە.

٢- «رَبَّنا لَكَ الحَمْدُ [161] حَمْداً كَثيراً، طَيِّباً مُبارَكاً فيهِ». [162]

واته: پەروەردگارمان ستایش بۆ تۆیە. ستایشێكی زۆری پاكی پیرۆز.

---

(١٥٩) ابوداود ١/٢٣٠ والنسائي واحمد واسناده حسن.

(١٦٠) البخاري مع الفتح ٢/٢٨٢.

(١٦١) وە هەندێ جار دەڵێ: «ربنا لك الحمد» رواه البخاري برقم(٧٩٦) (كە هەر كەسێك لە دوای ئیمامەوە بیڵێ و ووتنی ئەم لەگەڵ ووتنی مەلائیكەكاندا یەكگرێ بێت، ئەوا خوای گەورە لە گوناهەكانی پێشووی خۆش دەبێ)، وە هەندێ جار بۆ ئەم دووانە ووشەی «اللهم» پێشیەوە زیاد دەكات/ مسلم ١/٣٤٦.

(١٦٢) كابرایەك ئەمەی فەرموو: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (كێ ئەمەی ووت؟ فەرمووی: من. فەرمووی: بینیم سی و ئەوەندە مەلائیكەت هەڵپەیان بوو كرد كامیان بینووسن). البخاري مع الفتح ٢/٢٨٤. وە یان بڵێ: (..... مُبارَكاً عَلَيهِ كَما يُحِبُّ رَبُّنا وَيَرضى) البخاري ١/٢١٧ ومالك وابوداود. وە هەندێ جار لەجیاتی ئەوانە دەڵێ «لِرَبِّيَ الحَمْدُ. لِرَبِّيَ الحَمْدُ» ئەمە دووبارە دەكاتەوە/ رواه النسائي بسند صحيح (الارواء ٣٣٥).

٦- « أللهُمَّ اغفِر لي ذَنبـي كُلَّهُ. دِقَّهُ وَجِلَّـهُ. وَأوّلَـهُ وَآخِـرهُ، وَعَلانِيَتَهُ وَسِرَّهُ ».(١٧٠)

**واتە: خوایە لەهەموو گوناهەکانم خۆش ببە: بچوك و گەورەی، سەرەتاو کۆتایی‌و ئاشکراو پەنهانی.**

٧- « اللهُمَّ إنّي أعوذ برِضاكَ مِـنْ سَـخَطِكَ. وَبِمُعافاتِـكَ مِـنْ عُقوبَتِكَ. وَأعوذ بِكَ مِنْكَ. لآ أحصي ثَناءً عَلَيكَ. أنتَ كَما أثنَيـتَ عَلَى نَفسِـكَ ».(١٧١)

**واتە: خوایە: پەنا ئەگرم بە ڕەزای تۆ لە توڕەبوونت. وە پەنا ئەگرم بە لێبووردەیت لە سزادانت، وە پەنا ئەگرم پێت. ناتوانم ستایشی تۆ بژمێرم، تۆ بەو جۆرەی کە خۆت ستایشی خۆتت کردووە.**

## نزای دانیشتنی نێوان دوو کڕنوشەکە

١- « رَبِّ اغفِر لي. رَبِّ اغفِر لي ».(١٧٢)

**واتە: پەروەردگار لێم خۆش بە. پەروەردگار لێم خۆش بە.**

---

(١٧٠)مسلم ٣٥٠/١.

(١٧١)مسلم ٣٥٢/١.

(١٧٢)ابوداود ٢٣١/١ رقم(٨٧٤) والنسائي ١٩٩/٢ وابن ماجه(٨٩٧) وصحَّحَهُ الألباني في إرواء الغليل برقم (٣٣٥) وانظر صحيح ابن ماجه ١٤٨/١.

٢- « اللّهُمّ اغفِرْ لي، وَارحَمْني، وَاهدِني، وَاجبُرني، وَعافِني، وَارزُقني، وَارفَعني ». [١٧٣]

واته: خوایە لێم خۆش ببە و ڕەحمم پێبکەو ڕێنمایم بکەو نوقسانیم تەواو بکەو پارێزراوو لەش ساغم بکەو ڕۆزیم بدەو پلەم بەرز بکەرەوە.

# نزای کڕنوشی قورئان خوێندن

## ( سُجودُ التّلاوة )

١- « سَجَدَ وَجهيَ لِلّذي خَلَقَهُ، وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ بِحَولِهِ وَقُوّتِهِ {فَتَبارَكَ اللهُ أحسَنُ الخالِقينَ} ». [١٧٤]

واته: ڕووم کڕنوشی بردبۆ ئەوخوایەی بەدی هێناوە وبیستن و بینینی بۆ داڕشتووە بە گۆڕین و توانای خۆی. پاکەو بێ کەم و کورتیەو گەورەیی بۆ ئەو(الله)ی کە چاکترینی بەدی هێنەرانە.

٢- « اللّهُمّ اكتُبْ لي بِها عِندَكَ أجراً، وَضَعْ عَنّي بِها وِزراً، وَاجعَلها لي عِندَكَ ذُخراً، وتَقَبّلها مِنّي كَما تَقَبّلتَها مِن عَبدِكَ داود ». [١٧٥]

واته: خوایە بەهۆی ئەم کڕنوشەوە لەلای خۆت پاداشتم بۆ بنوسەو بەهۆیەوە گوناهم لەسەر لابەو لە لای خۆت پاداشتەکەیم بۆ هەڵگرە. وە لێم وەربگرە هەروەك چۆن لە بەندەی خۆت(داود) پێغەمبەرت وەرگرت(علیه الصلاة و السلام).

---

(١٧٣) أخرجه أصحاب السنن إلا النسائي وانظر صحيح الترمذي ١/٩٠ وصحيح ابن ماجه ١/١٤٨

(١٧٤) الترمذي ٢/٤٧٤ وأحمد ٦/٣٠ والحاكم وصححه ووافقه الذهبي ١/٢٢٠ والزيادة له.

(١٧٥) الترمذي ٢/٤٧٣ والحاكم وصَحّحَهُ ووافقه الذهبي ١/٢١٩.

# تەحییات( التشهُّد )

(( التَّحيّاتُ للهِ. والصَّلَواتُ. والطَّيِّباتُ. السَّلامُ عَلَيكَ أيُّها النَّبـيُّ[١٧٦] وَرَحمةُ اللهِ وَبَركاتُهُ. السَّلامُ عَلَينا وَعَلَى عِبادِ اللهِ الصالِحِين. أشْهَدُ أنْ لا إلهَ إلاّ اللهُ وَأشْهَدُ أنّ مُحَمّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ )).[١٧٧]

**واتە: (موڵک و مانەوەو گەورەیی)و(دروودو پاڕانەوەو لاڵانەوە)و ووشەی پاک و چاک هەر بۆ خوایە. سڵاوو ڕەحمەت و بەرەکەتی خوات لەسەربێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) سڵاو لەسەر ئێمەش و لەسەر هەموو بەندە چاکەکانی خوای گەورە. شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێک نییە بەحەق جگە لە (الله) وە شایەتی دەدەم کە محمد (ﷺ) بەندەو نێردراوی خوایە.**

## صلاوات دان لەسەر پێغەمبەر( ﷺ ) لە دوای تەحییات

(( اللّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمّدٍ. كَما صَلَّيتَ عَلَى إبراهيمَ. وَعَلَى آلِ إبراهيمَ. إنّكَ حَميدٌ مَجيدٌ. اللّهُمَّ بارِكْ عَلَى مُحَمّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمّدٍ. كَما بارَكْتَ عَلَى إبراهيمَ. وَعَلَى آلِ إبراهيمَ. إنّكَ حَميدٌ مَجيدٌ )).[١٧٨]

---

(١٧٦) ئەمە دەقی فەرموودەیەکی پێغەمبەرە (ﷺ) بەڵام دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاوەڵەکان( ڕەزای خوایان لێ بێت) دەیان فەرموو: ((... السَّلامُ على النَّبيِّ وَرَحمةُ الله وَبَركاتُهُ ))رواه البخاري. فتح الباري (٣٩٩/٢) رقم الحديث (٣٩٩) وانظر صفة صلاة النبي (ﷺ) ص ١٦٢.

(١٧٧) البخاري مع الفتح ١٣/١ ومسلم ٣٠١/١.

(١٧٨) البخاري مع الفتح ٤٠٨/٦.

واته: بە ناوی خوا. خوایە شەیطانمان لێ دوور بخەرەوە و شەیطان لەو منداڵەش دوور بخەرەوە کە پێمان دەبەخشی.

## ئەو نزاو پاڕانەوەی کە منداڵی پێ پەنا دەدرێ

ابن عەباس(ڕەزای خوایان لێ بێت) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) حەسەن و حوسەینی پەنا دەدا بەمە: «اعيذُكُما بكَلِماتِ اللهِ التامَّةِ. مِنْ كُلِّ شيطانٍ وَهامَّةٍ. ومِنْ كُلِّ عَينٍ لامَّةٍ».[٢٩١]

واتە: پەناتان دەدەم بە ووشە تەواوەکانی خوای گەورە، لە هەموو شەیطان و گیاندەرو زیندەوەرێکی زیانبەخشی خاوەن ژەهر. وە لە هەموو چاوێکی لۆمەکراوو پیس. ( یان – مِنْ كُلِّ عَينٍ لامَّةٍ – واتە: لە هەموو دەردو نەخۆشییەک کە مرۆڤ دەیگرێ لە شێتی‌و کەم عەقڵی)[٢٩٢]

وە دەیفەرموو: ئەمە ئیبراهیم پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام) ئیسماعیل و ئیسحاقی کوڕی پێ پەنا دەدا.[٢٩٣]

## ئەگەر منداڵتان بوو

١- هۆزەبانە(العقیقة)ی بۆ بکە. ئەویش سەربڕینی دوو مەڕە بۆ نێرو یەک مەڕ بۆ منداڵی مێینە.[٢٩٤]

---

(٢٩١) البخاري ١١٩/٤.

(٢٩٢) الفتح ٢٧٢/٦.

(٢٩٣) البخاري (٣٣٧١).

(٢٩٤) اخرجه الترمذي ٩٦/٤ رقم(١٥١٣) وقال: حديث حسن صحيح، وهو حديث صحيح.

٢- ئەمە لە ڕۆژی حەوتەم دا دەكرێت و منداڵەكە ناو دەنرێت بە ناوێكی جوانی شەرعی. (٢٩٥) ئەگەر نەكرا ئەتوانرێ لە(١٤) یان (٢١)دا بكرێ. (٢٩٦)

٣- وە گۆش(التحنيك) دەكرێت، ئەویش بە خورمایەك لەدەمی خۆت دا شلی بكەرەوەو بیدە لەمەلاشوویو دوعای خێری بۆ بكە. (٢٩٧)

٤- وە سەری دەتاشرێو بە ئەندازەی كێشەكەی زیو دەبەخشیتەوە بەسەر هەژاران دا. (٢٩٨)

---

(٢٩٥) اخرجه ابوداود ٢/٢٦٠ رقم(٢٨٣٨) والترمذي ١٠١/٤ رقم( ١٥٢٢) والنسائي ١٦٦/٧ رقم( ٤٢٢٠) وابن ماجه وغيرهم. وهو حديث صحيح. وانظر ابن ماجه (٣١٦٥).

(٢٩٦) موقوف على عائشة. انظر(صحيح الجامع الصغير).

(٢٩٧) صحيح( صحيح سنن ابي داود ٣/٩٦١). وهەروەها ئەبی موسی دەفەرموێت: (منداڵێكمان بوو بردم بۆلای پێغەمبەر(ﷺ)و ئەویش ناوی نا ئیبراهیم و خورمایەكی لە دەمی خۆیدا شل كردەوەو دەمووچاوی منداڵەكەی پێ شیرین كردو پاڕایەوە بۆی بە بەرەكەت و دایەوە پێم...). رواه البخاري(٦١٩٨) ومسلم من حديث ابي موسى الاشعري/ انظر تحفة الذاكرين ص١٨٢.

تێبینی: سەبارەت بە فەرموودەی بانگ دان بەگوێی منداڵدا بەتایبەتی ئۆزا لە حەوتەم ڕۆژیدا شێخی ئەلبانی دەفەرموێت: فەرموودەیەكی ضعيفە(بڕوانە سلسلة الاحاديث الضعيفة والموضوعة ١/٤٩٤، مكتبة المعارف- الرياض) بەڵام هەندێ لە زانایان كار بەم فەرموودەیە دەكەن لەوانە: ئیمامی النووي( بڕوانە الاذكار) وە ابن القيم لە(تحفة المودود)دا وە الدهلوي لە(حجة الله البالغة)، وە هەندێك زانای تر پێی وایە كە لە پێشینی چاكەوە وارد بووە كە كردوویانە... والله أعلم.

(٢٩٨) اخرجه احمد في المسند ٦/٣٩٠ والبيهقي في(السنن الكبرى) ٩/٣٠٤. وهو حديث حسن.

# فەزڵی سەردانی کردنی نەخۆش

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت:** « إذا عادَ الرَّجُلُ أخاهُ المُسلِمَ مَشَى فِي خِرافَةِ الجَنَّةِ حَتَّى يَجلِسَ. فإذا جَلَسَ غَمَرَتهُ الرَّحمَةُ. فإنْ كانَ غُدْوَةً صَلَّى عَلَيهِ سَبعُونَ ألفَ مَلَكٍ حَتَّى يُمسِي. وإن كانَ مَساءً صَلَّى عَلَيهِ سَبعُونَ ألفَ مَلَكٍ حَتَّى يُصبِحَ ».[٢٩٩]

**واتە: ئەگەر پیاوێک سەردانی برا موسڵمانەکەی بکات و نەخۆشییەکەی بەسەر بکاتەوە ئەوا بەناو باخێکی میوەی بەهەشت دا دەڕوات هەتا دادەنیشێ. وەکاتێ دانیشت بەزەیی خوایی دای دەپۆشێت و دای دەگرێتەوە. وەئەگەر بەیانی بێت حەفتا هەزار مەلائیکەت بۆی دەپاڕێنەوە هەتا ئێوارەی لێ دەبێتەوە. وەئەگەر ئێوارە بێت حەفتا هەزار مەلائیکەت بۆی دەپاڕێنەوە هەتا بەیانی لێ دەبێتەوە.**

## نزاو پاڕانەوە بۆ نەخۆش لە کاتی سەردانی کردنیدا

**١- پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر بچوایە بۆ سەردانی نەخۆشێک پێی دەفەرموو:** « لا بَأسَ طَهورٌ إن شاءَ الله ».[٣٠٠] **واتە هیچ نییە پاک دەبێتەوە لە گوناه بە ویستی خوای گەورە.**

---

(٢٩٩) رواه الترمذي وابن ماجه وأحمد وانظر صحيح ابن ماجه ١/٢٤٤ وصحيح الترمذي ١/ ٢٨٦ وصحّحهُ أيضاً أحمد شاكر.

(٣٠٠) البخاري مع الفتح ١١٨/١٠.

٣-( هیچ بەندەیەکی موسڵمان نییە کە سەردانی نەخۆشێك بکات کە ئەجەلی نەهاتبێ‌و حەوت جار بڵێ:« أسأل الله العظيم رَبَّ العرشِ العظيم أنْ يشفيكَ » ئیلا چاك دەبێتەوە).(٣٠١)

واتە: داوا ئەکەم لە خوای مەزنی پەروەردگاری عەرشی مەزن کە شیفات بدات.

٣« اللهُمَّ اشفِ عَبْدَكَ ينكأ لَكَ عدوّاً، أو يَمشي لَكَ إلى جَنازةٍ ».(٣٠٢)

واتە: خوایە شیفای بەندەکەت بدە تا دوژمنت بۆ بێزار بکات(بەوەی زۆریان لێ بریندارو کوشتارو بکات). یان لەبەر تۆ بچێت بە دوای جەنازەیەکداو شوێنی بکەوێ.

٤-« بِسْمِ الله أرقيكَ مِنْ كُلِّ شيءٍ يُؤذيكَ، وَمِنْ شَرِّ كُلِّ نَفْسٍ أو عَينِ حاسِدٍ الله يَشفيكَ، بِسْمِ الله أرقيكَ ».(٣٠٣)

واتە: بە ناوی خواوە دوعات بۆ دەکەم لە هەموو شتێك کە ئەزیەتت دەدات و لە خراپەی هەموو نەفسێك یان چاوی حەسوود بەرێك کە حەسوودیت پێ دەبات خوا شیفات بدات، بە ناوی خواوە دوعات بۆ دەکەم.

(٣٠١) أخرجه الترمذي وأبوداود وانظر صحيح الترمذي ٢/٢١٠، وصحيح الجامع ٥/١٨٠.

تێبینی : ئیشارە ئەمەش بە مەرجێك بە خوای گەورە ئەم دوعایەی لێ قبوڵ بکات.

(٣٠٢) صحيح سنن أبي داود(٣/٦٠٠) . وفي رواية:« أو يَمشي لَكَ إلى صلاةٍ » رواه أبوداود(٣١٠٧) والحاكم ١/٣٤٤، وقال: صحيح على شرط مسلم، وحَسَّنَهُ الألباني في صحيح الجامع برقم( ٤٤٦).

(٣٠٣) مسلم(١٧١٨/٤) عن أبي سعيد(ﷺ).

٥- « اللَّهُمَّ رَبَّ النَّاسِ، إذهَبِ البَأسَ واشفِ أنتَ الشَّافِي، لا شِفاءَ إلاَّ شِفاؤكَ، شِفاءً لا يُغادِرُ سَقَماً ». (٢٠٤)

واته: خوایه پەروەردگاری خەڵکی، ئەم ئازاره لابەرەو شیفای بده خۆت شیفا دەری دەردانی، هیچ شیفایەك نییه جگه له شیفای تۆ، شیفایەك كه هیچ نەخۆشییەك جێ نەهێڵێ.

## نزاو پاڕانەوەی ئەو نەخۆشەی دەستی لە ژیان شتووەو بێزار بووە

١- « اللَّهُمَّ اغفِرْ لِي وَارحَمْنِي وَألحِقْنِي بِالرَّفِيقِ الأعْلَى ». (٢٠٥)

واته: خوایه لێم خۆش بەو رەحمم پێبكەو بمگەیەنە بە هاوڕێیانی پله بەرز. (٢٠٦)

٢- له عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) لەكاتی سەرەمەرگیدا هەردوو دەستی دەخستە ناو ئاوەوەو دەیسڕین بەدەمەو چاویدا و دەیفەرموو: « لا إلهَ إلاَّ اللهُ إنَّ لِلمَوتِ لَسَكَراتٍ » (٢٠٧)

واته: هیچ پەرستراوێك نییه بەحەق جگه له(الله) به ڕاستی مردن ئازارو ناڕەحەتی خۆی هەیه.

---

(٢٠٤) البخاري مع الفتح (١٠/٢٠٦) ومسلم(٤/١٧٢١).
(٢٠٥) البخاري ٧/١٠ و مسلم ٤/١٨٩٣.
(٢٠٦) كه بریتین له پێغەمبەران(علیهم الصلاة والسلام) و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاكان. بڕوانه سورەتی(النساء: ٦٩). وه بڕوانه (قصص الأنبیاء)ی ابن كثیر لاپەڕە(٢١٠).
(٢٠٧) البخاري مع الفتح ٨/١٤٤ وه له فەرموودەكەدا(السواك) دا.

٣- « لا إلهَ إلاّ الله وَالله أكْبَرُ. لا إلهَ إلاّ الله وَحْـدَهُ. لا إلـهَ إلاّ الله وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ. لا إلهَ إلاّ الله لَهُ المُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ. لا إلـهَ إلاّ الله وَلا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إلاّ بِالله » (٣٠٨)

واتە: هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لەالله و خوا گەورەیە. هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لەالله و تاكە. هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لەالله و تاكەو بێ هاوبەشە. هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لەالله و موڵكەو ستایش بۆئەوە. هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لەالله و گۆڕان و توانا نییە مەگەر بەوەوە.

## نزاو پاڕانەوەی نەخۆش بۆ خۆی

(دەستت بخەرە سەر ئەو شوێنەی ئازاری هەیە لە لەشت داو سێ جار بڵێ: « بِسمِ اللهِ » وە حەوت جار بڵێ: « أعوذُ بالله وَقُدرَتِهِ مِنْ شَرِّ ما أجِدُ وأُحاذِرُ » (٣٠٩)

واتە: پەنا ئەگرم بە خوای گەورەو قودرەت و توانای لە خراپەی ئەو ئازارەی هەستی پێئەكەم و سڵی لێ ئەكەمەوە.

---

(٣٠٨) هەركەسێك ئەمە كۆتا ووتەی بێت لاشەی ئاگری دۆزەخ نایخوات/ أخرجه الترمذي وابن ماجه وصححه الألباني. وانظر صحيح الترمذي ٣/ ١٥٢. و صحيح ابن ماجه ٢/٣١٧.

(٣٠٩) مسلم ٤/١٧٢٨.

# چارەسەری برینداری و زام

(پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر مرۆڤێك ناساغ بووایەو ئازاری هەبووایە یان برینداری یان زامی پێوە بووایە پەنجەی ئاوا لێ دەکردو دەیفەرموو – وە سوفیان(کە راوییەکە) پەنجەی شایەتمانی دەدا لە زەوی - پاشان بەرزی دەکردەوەو دەیفەرموو:

« بِسمِ اللهِ تُرْبَةُ أرضِنا بريقَةِ بَعْضِنا يُشفَى سَقيمُنا بإذنِ رَبِّنا ». [٢١٠]

واتــە: بەناوی خـوا، گـڵ و خـۆڵی زەوییەکـەمان بـەلیکی هەندێکمانەوە دەبێتە شیفا بۆ نەخۆش و ناساغەکانمان بە ئیزنی پەروەردگارمان.

( وە مانای فەرموودەکە وادەگەیەنێ کە هەندێ لە لیکی خۆی دەکرد بە پەنجەی شایەتمانیەوە، پاشان دەیخستە سەر گڵەکەو هەندێکی لێ هەڵدەگرت و دەیهێنا بەشوێنی برینداریەکە. یان ناساغییەکەداو ئەم ووتەو نزایەی لەم حاڵەتی پێدامێنانەدا دەفەرموو ). [٢١١]

---

(٢١٠) البخاري مع الفتح ٢٠٦/١٠، ومسلم ١٧٢٤/٤ برقم (٢١٩٤)

(٢١١) انظر: شرح النووي على صحيح مسلم ١٨٤/١٤ وفتح الباري ٢٠٨/١٠ وە بڕوانە پوونکردنەوەیەکی ترزی ئەم فەرموودەیە لە (زاد المعاد) ١٨٦/٤ - ١٨٧

# چارەسەری پێوەدراوی مارو دووپشك

## ( اللسعة واللدغة )

١- سورەتی ﴿ الفاتحة ﴾ دەخوێنی لەگەڵ کۆکردنەوەی تفی دەمت و تف کردنە سەر شوێنی پێوەدراوییەکە.[٣١٢]

٢- بە ئاوو خوێ شوێنی پێوەدراوییەکە مەسح بکە لەگەڵ خوێندنی سورەتی ﴿ قُلْ يا أيُّها الكافرون ﴾ و﴿ الفَلَق ﴾ و ﴿ النّاس ﴾[٣١٣]

## چارەسەری ( تا )

قال(ﷺ): « الحُمّى من فَيحِ جَهَنَّمَ فأبردوها بالماء » [٣١٤]

واتە: (تا) لە هاڵاوو لە پریشکی دۆزەخەوەیە ئەگەر تووشتان هات بە ئاو ساردی بکەنەوە.

---

(٣١٢) البخاري مع الفتح ١٠/٢٠٨.

(٣١٣) الطبراني في المعجم الصغير ٢/٨٣٠ ، وانظر مجمع الزوائد ٥/١١١ وحسّن إسناده.

(٣١٤) البخاري مع الفتح ١٠/١٧٤ ومسلم ٤/١٧٣٢.

## تەلقین دادانی كەسێك كە لەسەرەمەرگ دا بێت

« مَنْ كانَ آخِرُ كَلامِهِ لآ إلهَ إلاّ اللهُ دَخَلَ الجَنَةَ ». [٣١٥]

واتە: هەر كەسێك كۆتا ووتەی لە دونیادا(لآ إلهَ إلاّ الله) بێت دەچێتە بەهەشتەوە.

## ئەگەر تووشی موسیبەتێك بوو( كەسێكی مرد )

خوای گەورە دەفەرموێت﴿ ...وَ بَشِّرِ الصّابِرينَ * الَّذينَ إذا أصابَتهُم مُصيبَةٌ قالوا إنا للهِ وَ إنا إليهِ راجِعونَ * أولئِكَ عَلَيهِم صَلَواتٌ مِنْ رَبِّهِم وَ رَحمَةٌ وَأولئكَ هُم المُهتَدونَ * ﴾.(البقرة: ١٥٥-١٥٧)

واتە: ... وە مژدە بدە بە ئارامگران ئەوانەی كاتێ تووشی موسیبەتێك دەبن دەڵێن ئێمە موڵكی خواین و هەر بۆلای ئەودەگەڕێینەوە، ئەوانە ستایش و سەنا و رەحمەت و ئەمینیان بۆ هەیە لە سزا لە لایەن خوای پەروەردگاریانەوە و ئەوانەش بە ڕاستی هیدایەت دراوانن.[٣١٦]

(٣١٥) ابوداود ٣/ ١٩٠ وانظر صحيح الجامع ٥/٤٣٢. وفي رواية« مَنْ كانَ آخِرُ كَلامِهِ مِنَ الدنيا...» رواه ابوداود(٣١١٦) والحاكم ١/٣٥١، وحَسَّنَهُ الالباني في إرواء الغليل برقم(٦٨٧). ورواه مسلم بلفظ« لَقِّنوا مَوتاكُم لا إلهَ إلاّ الله» مسلم ٦/٢١٩ عن ابي سعيد وفي رواية عن ابي هريرة. وابن حبان(٧١٩) موارد بلفظ: « لَقِّنوا مَوتاكُم لا إلهَ إلاّ الله فإنَهُ مَن كانَ آخِرُ كَلامِهِ لا إلهَ إلاّ الله دَخَلَ الجَنّةَ يَوماً مِنَ الدَهرِ وَإنْ أصابَهُ قَبلَ ذلكَ ما أصابَهُ» انظر احكام الجنائز /١٠. واتە: تەلقینی ئەو كەسانەتان بكەن كە لەسەرە مەرگدان بە ووتنی(لا إلهَ إلاّ الله) تا بیڵێن چونكە هەركەسێك كۆتا ووتەی(لا إلهَ إلاّ الله) بێت دەچێتە بەهەشتەوە هەر رۆژێك بێ ئەگەرچی پێشتریشەوە تووشی ئەوەببێ كە تووشی دەبێ لە سزا.

(٣١٦) تفسير القرآن العظيم ١/ ١٨٤.

١- « ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾ اللَّهُمَّ اجْرُنِي فِي مُصِيبَتِي وَأَخْلِفْ لِي خَيْراً مِنْهَا ».(٣١٧)

**واتە: ئێمە موڵكی خواین و بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە. خوایە پاداشتم بدەیتەوە لەم موسیبەتەمداو كەسێكی باشترم بۆ بخەرەوە جێگەی.**

٢- **یان بڵێ:** « اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَلَهُ. وَأَعْقِبْنِي مِنْهُ عُقْبَى حَسَنَةً ».(٣١٨)

**واتە: خوایە لە من و لە ئەویش(مردووەكە) خۆش ببەو كەسێكی چاكم بۆ بخەرەوە شوێنی.**

## لە كاتی داخستنی چاوی مردوویەك دا

« اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِفُلَانٍ **(ناوەكەی دەڵێی)** وَارْفَعْ دَرَجَتَهُ فِي الْمَهْدِيِّينَ. وَاخْلُفْهُ فِي عَقِبِهِ فِي الْغَابِرِينَ. وَاغْفِرْ لَنَا وَلَهُ يَا رَبَّ الْعَالَمِينَ، وَافْسَحْ لَهُ فِي قَبْرِهِ وَنَوِّرْ لَهُ فِيهِ ».(٣١٩)

**واتە: خوایە لە فڵانەكەس خۆش ببەو پلەی بەرزبكەرەوە لە ناو ڕێنموویی كراواندا,و لە پاش ئەو كەسێكی دڵسۆز جێ بهێڵە بۆ كەس وكاری,و بیكەرە جێنشینی. وە لە ئێمەو لەویش خۆش ببە ئەی پەروەردگاری جیهانیان و گۆڕەكەی بۆ فراوان بكەو بۆی ڕۆشن و نووردار بكە.**

---

**(٣١٧) هیچ موسڵمانێك نییە كە موسیبەتێكی ئازاری تووش ببێ و وەك ئەوەی خوای گەورە فەرمانی پێكردووە بڵێ (إنا لله ......) (لەمووەكە...) ئیلا خوای گەورە كەسێكی چاكتری لە پاش ئەو بۆ دەداتە شوێنی/ مسلم ٢/٦٣٢**

**(٣١٨)مسلم ٢/٦٣٢.**

**(٣١٩)مسلم ٢/٦٣٤.**

# ئاوات نەخواستنی مردن

(هیچ کەسێک لە ئێوە ئاواتی مردن نەخوازێ) بەهۆی ناڕەحەتییەکەوە کە تووشی هاتووە). [٢٢٠] ئەگەر هەرئەبوو بیڵێ با بڵێ: «اللَّهُمَّ أحيني ما كانتِ الحَياةُ خيراً لي، وتوفَّني إذا كانتِ الوفاةُ خيراً لي». [٢٢١]

واتە: خوایە بمژێنە هەتا ئەو کاتەی ژیان چاکە بۆم و بممرێنە ئەگەر مردن خێری تێدا بوو بۆم.

# نوێژی مردوو

نوێژی مردوو فەرزی کیفایەیە (واتە ئەگەر چەند کەسێک ئەنجامی بدەن لەسەر موسڵمانان لادەچێ‌و بە نەکردنی هەموو موسڵمانانی ئەو ناوچەیە گوناهبار دەبن)وە ئەم نوێژە کڕنوش و چەمینەوەی تێدا نییە. ڕاسترین شێوەی چوار تەکبیر (الله أكبر)ە، وە پێنج تەکبیر تا نۆ تەکبیر کردن هاتووە.

---

(٢٢٠) دروست نییە موسڵمان ئاواتی مردن بخوازێ. لەبەرئەوەی چاکترین کەس ئەوکەسەیە کە تەمەنی درێژ بێت وکردەوەی چاکی زۆر بێت.وە تا گوناه کەم بکاتەوەو پەشیمان بێتەوە لێی. هەروەها لەبەر سەختیی ناڕەحەتی مردن و ژیانی ناو گۆڕ. بەڵام ئەگەر موسڵمان لە دین و ئیمانی ترسی هەبوو کەزیانی پێ بگات لەکاتی زۆربوونی فیتنەو ئاشووبدا، ئەوا ئەو کاتە دروستە ئاواتی مردن بخوازێت تا ژینی کۆتایی پێ بێت بەڵام دینی سەلامەت بێت.

(٢٢١) البخاري ١٠/١٠٧، ١٠٨ ومسلم (٢٦٨٠).

وە ئەصڵ وەھایە تەنھا لە تەکبیری یەکەمی نوێژ دابەستندا دەست بەرز بکرێتەوە.

پوو بە(قیبلە) دەوەستێت و مردووەکە لەبەردەم خۆیدا دادەنێ‌و ئەگەر مردووەکە پیاو بوو لەلای سەرییەوەو ئەگەر ئافرەت بوو لەلای ناوەڕاستییەوە دەوەستێو تەکبیری دابەستن دەکاو دەست بەرز دەکاتەوەو پاشان دەست دەگرێ‌و سورەتی ﴿ الفاتحة ﴾و سورەتێکی تر دەخوێنێت بەبێ دوعای دەست پێکردن (الإستفتاح)، وە تەکبیری دووەم دەکات و صەڵەوات دەدات لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) [٢٢٢].

وە لە دوای تەکبیری سێیەم و چوارەم و...هتد دەپاڕێتەوە بۆ مردووەکە بەو پاڕانەوەی کە ئێستا پێی دەگەین. وە بە دەنگی نزم ئەم نوێژە دەکرێت ئەگەر ئیمام بوو، مەگەر لەبەر فێرکردنی خەڵکەکە دەنگ بەرز بکاتەوەو سڵاویش دەداتەوە هەر بە دەنگی نزم بە جۆرێک تەنھا دوای خۆی بیبیستن و بە یەک سڵاویش دەتوانێت سڵاوبداتەوە( واتە بە یەک لادا)، بەڵام لە سێ کاتدا ئەم نوێژە دروست نییە مەگەر لەبەر ناچاری:( کاتێ خۆر هەڵدێ تا بەرز دەبێتەوە بە تەواوی) وە ( کاتێک خۆر دەچێتە ناوەڕاستی

---

(٢٢٢) بڕوانە لاپەڕە (٨٦-٨٧) لەم نامیلکەیەدا. وە زۆر جۆری صەڵەوات هەیە بەهەرکامیان بێت دروستە.

ئاسمان □ لاتحدات) وە ( کاتێك خۆر سەر دەبات بۆ ئاوا بوون □ ئاوا دەبێت). (٣٢٣) وە هەتا نوێژکەران لەسەری زیاتر بن چاکترە، لەو فەرموودانەش کە باسی ئەمە دەکات:

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (( هەر مردوویەك گرۆهێك لە موسڵمانان لەسەری نوێژ بکەن و ژمارەیان بگاتە سەد کەس و تکای بۆ بکەن لە خوا، خوای گەورە پاڕانەوەو تکایان وەردەگرێ )). (٣٢٤)

وە دەفەرموێت(ﷺ): « هەر پیاوێکی موسڵمان بمرێت و لەسەر جەنازەکەی چل پیاوی یەکتاپەرست بوەستن کە هاوەڵیان هیچ بۆ خوا دانەنابێ، ئیلا خوای گەورە تکایان وەردەگرێت ». (٣٢٥)

وە دەفەرموێت(ﷺ): « هەر کەسێك سێ ڕیز لە خەڵکی لەسەری نوێژ بکات، بەهەشتی بۆ واجب دەبێت ». (٣٢٦)

---

(٣٢٣) بڕوانە دەربڕاوی ئەمە بەبەڵگەکانییەوە لە(احکام الجنائز)ی الالبانیدا (ڕەحمەتی خوای لێ بێت).

(٣٢٤) صحیح مسلم بشرح النووي – کتاب الجنائز – ٧/٢١ رقم (٩٤٧) والجامع الصغیر للترمذي ٣/٢٤٨ رقم (١٠٣٩) وە لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ:... ئەوا خوای گەورە لێیان خۆش دەبێ.

(٣٢٥) شرح صحیح مسلم ٧/٢١-٢٢ رقم (٩٤٨) وصحیح ابن ماجه (١٤٨٩).

(٣٢٦) رواه ابوداود (٣١٦٦) والترمذي (١٠٢٨) وقال: حدیث حسن. واخرجه ابن ماجه (١٦٩٠) ومسند احمد ٤/٧٩ وصححه الحاکم في المستدرك ٣٦٢/١ ووافقه الذهبي.

# پاڕانەوە بۆ مردوو لە نوێژی مردوودا

١- «اللهُمَّ اغفرْ لَهُ. وارْحَمْهُ. وعافِهِ واعفُ عَنْهُ. وأكْرِمْ نُزُلَهُ. وَوَسِّعْ مُدْخَلَهُ. وَاغْسِلْهُ بالماءِ وَالثَّلجِ والبَرَدِ. وَنَقِّهِ مِنَ الخَطايا كما نَقَّيْتَ الثَّوبَ الأبيضَ من الدَّنسِ. وأبدِلْهُ داراً خيراً مِنْ دارِهِ. وأهلاً خيراً مِنْ أهْلِهِ. وزوجاً خيراً مِنْ زوجِهِ. وادخِلْهُ الجَنَّةَ. وأعِذْهُ مِنْ عَذابِ القبْرِ [وعَذابِ النّارِ]».[٣٢٧]

**واتە: خوایە لێی خۆش ببە و ڕەحمی پێ بکەو بیپارێزەو لێی ببوورە و لەشوێنگەیەکی خۆش و بەرێزدا دایبنێ و شوێنەکەی بۆ فراوان بکەو بەئاوی باران و بەفرو تەرزە بیشۆرەوە لە گوناه پاکی بکەرەوە هەروەک چۆن پۆشاکی سپی پاک دەبێتەوە لە چڵک. وە ماڵەکەی بۆ بگۆڕە بەخانەیەکی خۆش تر و کەس وکارێکی بدەرێ لە کەس و کارەکەی چاکتر خێزانێکی بدەرێ لەخێزانەکەی باشتر و بیخەرە بەهەشتەوە و پەنای بدە لە سزای گۆڕو سزای ئاگری دۆزەخ.**

٢- «اللهُمَّ اغْفِرْ لِحَيِّنا. وَمَيِّتِنا. وشاهدنا. وغائبنا. وصغيرنا وكبيرنا. وذكرنا وأنثانا. اللهُمَّ مَنْ أحيَيْتَهُ مِنّا فأحْيِهِ عَلَى الإسلامِ. وَمَنْ تَوَفَّيْتَهُ مِنّا فَتَوَفَّهُ عَلَى الإيمانِ. اللهُمَّ لا تَحْرِمْنا أجرَهُ وَلا تُضِلَّنا بَعْدَهُ».[٣٢٨]

---

(٣٢٧) لەعەوفی کوڕی مالکی ئەشجەعییەوە (رضي الله عنه) دەفەرموێ: ... ئاواتم ئەخواست کە ئەو مردووە من بوومایە لەبەرئەو پاڕانەوەیەی کە پێغەمبەر (ﷺ) لەسەری پاڕایەوە/ مسلم ٢/٦٦٣.

(٣٢٨) ابن ماجه ١/٤٨٠ واحمد ٢/٣٦٨ وانظر صحيح ابن ماجه ١/٢٥١.

واته: خوایه خۆش ببه له زیندووو مردوومان و له ئامادەو نائامادەمـان و بـچووك و گـەورەمان و نێـرو مێـمان. خوایـه هەركەسێكمانت ژیاند لەسەر ئیسلام بیژێنەو هەركەسێكمانت مراند لەسەر ئیمان بیمرێنە. خوایه له پاداشتی ئەم موسیبەتە بێبەشمان مەكـەو لـەدوای ئـەم كەسـە سەرلێـشێواوو گومرامان مەكە.

٣- « اللهُمَّ إنَّ فُلانَ بنَ فُلانٍ فِي ذِمَّتِكَ. وَحبلِ جوارِكَ. فَقِهِ مِنْ فِتْنَةِ القَبْرِ وَعَذابِ النّار. وَأنْتَ أهلُ الوَفَاءِ وَالحَقِّ. فاغْفِرْ لَهُ وَارحَمْهُ إنَّكَ أنْتَ الغَفُورُ الرَّحِيم ». (٣٢٩)

واته: خوایه فلانی كوڕی فلان له ژێر پارێزگاری تۆدایەو له ژێر چاودێریەو دەستەلاتی تۆدایه. له ئاشوبەی گۆڕو سزای ئاگر بیپارێزە. وه تۆ خاوەنی وەفاو ڕەواییت. سا خوایه لێی خۆش ببەو بەزەیت پێیدا بێتەوه بەڕاستی تۆ لێبووردەو بەبەزەییو میهرەبانیت.

٤- « اللهُمَّ عَبْدُكَ وَابنُ أمَتِكَ احتاجَ إلى رَحْمَتِكَ. وَأنتَ غَنيٌّ عَـنْ عَذابِهِ. إنْ كـانَ مُحْـسِناً فَـزِدْ في حَـسَناتِهِ. وَإنْ كـانَ مُـسِيئاً فَتجاوَزْ عَنْهُ ». (٣٣٠)

---

(٣٢٩) أخرجه ابن ماجه. انظر صحيح ابن ماجه ٢٥١/١ ورواه أبوداود ٢١١/٢.

(٣٣٠) أخرجه الحاكم وصحّحه ووافقه الذهبي ٣٥٩/١ وانظر أحكام الجنائز للألباني ص ١٢٥.

واتە: خوایە ئەمە بەندەتەو ئەوەی کۆیلەتە پێویستی بەبەزەیی تۆیە. وە تۆش دەوڵەمەندو بێنیازی لە سزادانی. ساخوایە ئەگەر چاکەکارە ئەوا لەچاکەکانی زیاد بکەو ئەگەر خراپەکارە لـێی ببورە.

## پاڕانەوە بۆ( کۆرپە ) لە نوێژی مردوودا لەسەری

١- « اللهُمَّ أعِذْهُ مِنْ عَذابِ القَبرِ ».(٣٣١)

واتە: خوایە پەنای بدە لە سزای گۆڕ.

٢- « اللهُمَّ اجعَلْهُ لَنا فَرَطاً. وَسَلَفاً. وَأجراً ».(٣٣٢)

واتـە: خوایـە بۆمـان بکـەرە پاداشـتێك لـە پێـشمانەوە بڕوات و بیکەرە پێشین و پاداشت بۆمان.

## بۆ دڵ دانەوەی کەس و کاری مردوو( دُعاء التَّعزية )

« إنَّ للهِ ما أخَذَ. وَلَهُ ما أعطى. وَكُلُّ شيءٍ عِندَهُ بِأجَلٍ مُـسَمَّى... فَلتَصْبِـرْ وَلتَحْتَسِـبْ ».(٣٣٣)

---

(٣٣١) (سەعیدی کوڕی المسیب دەفەرموێ: لە دوای ئەبی هورەیرەوە نوێژم کرد کە لەسەر منداڵێکە نوێژی دەکرد کە هەرگیز گوناهی نەکردبوو گوێم لـێ بوو دەیفەرموو... ... فەرموودەکە). أخرجه مالك في الموطا ١/٢٨٨ وابن أبي شيبة في المصنف ٣/٢١٧ والبيهقي ٤/٩. وصحّحَ اسناده شعيب الارناؤوط في تحقيقه لشرح السنة للبغوي ٥/٣٥٧. وهو حسن (احكام الجنائز للألباني ص ١٦١.

(٣٣٢) أخرجه البغوي في شرح السنة ٥/٣٥٧ وعبدالرزاق برقم ٦٥٨٨. وعَلَّقَهُ البُخاري في كِتاب الجَنائِز ٦٥ باب قراءة فاتحة الكتاب على الجنازة ٢/١١٣. وهو موقوف على الحَسَن.

(٣٣٣) البخاري ٢/٨٠ ومسلم ٢/٦٣٦.

واتە: خوا خاوەنی ئەو شتەیە کە ئەیباتەوەو خاوەنی ئەوەشە کە ئەیبەخشێ، وە هەموو شتێك لە لای ئەو بەکات و بە ئەجەلێکی دیاری کراوە، ئا ئارام بگرەو ڕازی بە بەم ئاگیرکردنەوەو موسیبەتە بە نیازی پاداشت لە خوای گەورە.

## خواردن ناردن بە دیاری بۆ کەس و کاری مردووەکە

عَن عَبدالله بن جَعفَر قال: قـالَ رسـول الله(ﷺ): « إصنعوا لآلِ جَعفَرٍ طَعاماً، فإنّهُ قد أتاهُم أمرٌ شَغَلَهُم ».(٣٢٤)

عبدالله ی کوڕی جەعفەر ئەفەرموێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: خواردنێك دروست بکەن بۆ کەس و کاری جەعفەر چونکە شتێکیان بەسەر هاتووە کە بە ڕاستی سەرقاڵی کردوون. ئەمەیش لە کاتێکدا فەرمووی کە جەعفەری کوڕی ئەبی طالب(خوای لێ ڕازی بێت) لە جەنگی(مؤتە) دا شەهید بوو.

## ئەگەر مردووت خستە گۆڕەکەی

بڵێ: « بِسمِ اللهِ وَعلى سُنّةِ رَسُولِ اللهِ ».(٣٢٥)

واتە: بە ناوی خوای گەورە. وە لەسەر ڕێڕەوی سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ).

---

(٣٢٤) أخرجه أبوداود ٣/٤٩٧ وابن ماجه ١/٥١٤ والترمذي ٣/٣٢٣ وقال: حديث حسن صحيح. وهو كما قال.

(٣٢٥) أبوداود ٣/٣١٤ بسَنَدٍ صَحيح. وأحمد بلفظ: « بسم اللهِ وَعَلى مِلّةِ رَسولِ الله » وسنده صحيح.واتە: بەناوی خواو لەسەر میللەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ). وانظر (صحيح الترمذي) ١/٣٠٦.

# پاڕانەوە دوای ناشتنی مردوو

« اللهُمَّ اغفِرْ لَهُ ، اللهُمَّ ثَبِّتْهُ ». (٢٢٦)

**واتە: خوایە لێی خۆش بە، خوایە چەسپاوو دامەزراوی بکە.**

# لەکاتی سەردانی گۆڕستان دا

« السَّلامُ عَلَيكُمْ أهلَ الدِّيارِ . مِنَ المُؤمِنِينَ وَالمُسلِمِينَ. وإنَّا إنْ شَاءَ اللهُ بِكُم لاحِقونَ [وَيَرحَمُ اللهُ المُستَقدِمِينَ مِنَّا وَالمُستَأخِرِينَ ] أسألُ اللهَ لَنا وَلَكُمُ العافِيةَ ». (٢٢٧)

**واتە: سڵاوتان لێ بێت خاوەنی خانەکان لە ئیمانداران و موسڵمانان ئێمەش بە ویستی خوای گەورە دەگەین پێتان. خوا بەزەیی بە پێشکەوتووەکانمان و دواکەوتەکانماندا بێتەوە. لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە ئێمەو ئێوەش بپارێزێ.**

**تێبینی: داوای لێ خۆشبوون کردن بۆ کەسێك لەسەر بێ باوەڕێتی مردبێت دروست نییە، وەپێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی کردووە کە هەر کاتێك بە لای گۆڕی بێ بڕوایەکدا ڕەت بووین مژدەی دۆزەخی پێ بدەین( بەو مەرجەی دڵنیابین لەوەی بە بێ بڕوایی مردووە)**

---

(٢٢٦) پێغەمبەر (ﷺ) کە لەوەو دەبوو لە ناشتنی مردوو لەسەری رادەوەستاو دەیفەرموو: « داوای لێخۆشبوون و دامەزراوی بکەن بۆ براکەتان. چونکە بەراستی ئێستا پرسیاری لێ دەکرێت » ابوداود ٣/٢١٥ والحاكم وصححه ووافقه الذهبي ١/٣٧٠.

(٢٢٧) مسلم ٢/٦٧١. وابن ماجه واللفظ له ١/٤٩٤ عن بريدة (ﷺ) وە ئەوەی نێوان دوو کەوانەکە لەو فەرموودەیە کە عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەیگێڕێتەوە.

## بەشی حەوتەم:

# هەندێ کاتی تری جیاواز

## لە کاتی هەڵکردنی( بــا )دا

١- « اللهُمَّ إنِّي أسألُكَ خيرَها، وَأعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّها ». (٣٣٨)

**واتــە: خوایــە داوای چـاکیو خێرەکـەیت لــێدەکەمو پـەنات پێدەگرم لەخراپەکەی.**

٢- « اللهُمَّ إنِّي أسألُكَ خيرَها، وَخيرَ ما فيها، وخيرَ ما أُرسِلَتْ بِــهِ، وَأعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّها، وَشَرِّ ما فِيها، وَشَرِّ ما أُرسِلَتْ بِهِ ». (٣٣٦)

**واتــە: خوایــە مــن داوای خێــرو چــاکەکەیت لــێدەکەمو ئەوچاکەیەی کە تیایەتیو ئەو چاکەیەی بۆی نێردراوە. وە پەنات پێدەگرم لـە خراپەکـەیو لـەو خراپەیـەی کـە تیایـەتیو ئـەو خراپەیەی بۆی نێردراوە.**

**٣- جوێن بـە – بـا – مەدەن. ئەگەر قایمی کردو خراپەیەکتان لـێچاوەڕوان دەکرد بڵێن:** « اللهُمَّ إنَّا نَسألُكَ مِنْ خيرِ هذِهِ الــرِّيحِ وَخيرِ ما فِيها، وَخيرِ ما أُمِرَتْ بِهِ، وَنَعوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ هذِهِ الرِّيحِ وَشَرِّ ما فِيها، وَشَرِّ ما أُمِرَتْ بِهِ ». (٣٤٠)

---

(٣٣٨)أخرجه ابوداود ٣٢٦/٤ وابن ماجه ١٢٢٨/٢ وانظر صحيح ابن ماجه ٢٩٥/٢.

(٣٣٩)مسلم ٦١٦/٢ والبخاري ٧٦/٤.

(٣٤٠)رواه الترمذي(٢٢٥٢) قال: حديث حَسَن صحيح ورجالهُ ثقات عن أُبي بن كعب (ﷺ)

واته: خوایه ئێمە داوای چاکەی ئەم بایەت لێدەکەین و داوای ئەو چاکەیەت لێ دەکەین کە تیایەتی و فەرمانی پێکراوە. وە پەنات پێدەگرین لەخراپەی ئەم بایەو ئەو خراپەیەی کە تیایەتی و خراپەی ئەوەی فەرمانی پێکراو کە بیکات.

## پاڕانەوەی کاتی هەورەگرمە (الرّعد)

عبدالله ی کوڕی الزبیر (ڕەزای خوایان لێبێت) ئەگەر گوێی لە هەورەگرمــە بوایــە وازی لەقــسەکردن دەهێنــاو دەیفــەرموو:

« سُبحانَ الّذي يُسَبِّحُ الرَّعْدُ بِحَمْدِهِ وَالمَلائِكَةُ مِنْ خِيفَتِهِ » (٢٤١)

واتە: پاکی و بێگەردی بۆئەو خوایەی هەورەگرمە تەسبیحات و ستایشی دەکات. وە فریشتەکانیش لەترسی ئەو تەسبیحاتی دەکەن .

## لە پاڕانەوەکانی داوای باران بارین کردن (الإستسقاء)

١- « اللهُمَّ اسقِنا غَيْثاً مُغيثاً مَريئاً مَريعاً. نافِعاً غَيرَ ضــارٍّ عــاجِلاً غيرَ آجِلٍ ». (٢٤٢)

واتە: خوایە بارانمان بۆ ببارێنە بارانێکی بە لێزمەی ئاسانی سەوزکەری گژوگیاو بەسوودی بێ زیان. بەم زووانەو دوای مەخە بۆمان.

(٢٤١)الموطا ٩٩٢/٢ وقال الألباني: صحيح الإسناد موقوفاً.
(٢٤٢)ابوداود ٣٠٣/١ وصَحَّحَهُ الألباني في صحيح ابوداود ٢١٦/١.

٢- « اللهمَّ أغثنا، اللهمَّ أغثنا، اللهمَّ أغثنا » (٣٤٣)

واته: خوایه بارانمان بۆ ببارێنەو فریامان بکەوە،.......

٣- « اللهمَّ اسقِ عبادك وبهائمك، وانشرْ رحمتك، وأحيِ بلدكَ الميّت » (٣٤٤)

واته: خوایه بەندەکانت تێر ئاوبکە، هەروەها گیانلەبەرانیش. وە بەزەیی خۆت بڵاوبکەرەوەو شارە مردووەکەت زیندوو بکەرەوە.

## لە کاتی باران بارینداا

« اللهمَّ صيّباً نافعاً » (٣٤٥)

واته: خوایه بارانێکی بە لێزمەی بە سوود بێت.

## ذیکری دوای بارینی باران

« مُطِرْنا بفضلِ الله ورَحْمته » (٣٤٦)

واته: بارانمان بۆ باری بە فەزڵ و سۆزو ڕەحمەتی خوای گەورەوە.

---

(٣٤٣) البخاري ٢٢٤/١ ومسلم ٦١٢/٢.

(٣٤٤) ابوداود ٣٠٥/١ وحسَّنهُ الالباني في صحيح ابي داود ٢١٨/١.

(٣٤٥) البخاري مع الفتح ٥١٨/٢، وە بە(اللهم صيبا هنيئا) هاتووە، اخرجه ابو داود (٥٠٩٩) وصححه الالباني في صحيح سنن ابي داود

(٣٤٦) البخاري ٢٠٥/١ ومسلم ٨٣/١.

## لەو پاڕانەوانەی کە بۆ خۆش کردنەوەی باران دەوترێ (الإستصحاء)

« اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلا عَلَيْنَا. اللَّهُمَّ عَلَى الآكَامِ وَالظِّرَابِ. وَبُطُونِ الأَوْدِيَةِ وَمَنَابِتِ الشَّجَرِ ».[٢٤٧]

**واتە: خوایە لە چوار دەورمان بیبارێنەو لەسەرمان مەیبارێنە، خوایە بیبە بۆ سەرگردو کورتە شاخ و ناو شیوو دۆڵەکان و شوێنی ڕوانی دارو درەختەکان.**

## لە کاتی تەماشاکردنی مانگ (القَمَر)دا

« أعوذُ بالله من شرِّ هذا الغاسقِ إذا وَقَبَ ».[٢٤٨]

**واتە: پەنا ئەگرم بە خوای گەورە لە خراپەی ئەم تاریکییەی شەو کە دادێت.**

## لە کاتی بینینی هەیڤ (مانگی یەك شەوە) (الهلال)دا

« اللهُ أكبرُ. اللَّهُمَّ أهِلَّهُ علينا بالأمْنِ والإيمانِ. والسَّلامةِ والإسلامِ. والتَّوفيقِ لما تُحبُّ رَبَّنا وتَرضى. رَبُّنا وربُّكَ اللهُ ».[٢٤٩]

---

(٢٤٧) البخاري ١/ ٢٢٤ ومسلم ٢/٦١٤.

(٢٤٨) أخرجه الترمذي(٩/٣٠٢ تحفة) والحاكم في المستدرك من حديث عائشة. قال الترمذي: حديث حسن صحيح، انظر مختصر تفسير ابن كثير ٢/٦٩٥: وقال الحاكم: صحيح الإسناد. وأخرجه من حديثه أيضا النسائي انظر (تحفة الذاكرين)ص ١٧٧ وهو حديث حسن. وصحّحهُ الألباني. انظر السلسلة الأحاديث الصحيحة(١/٦٤٧).

(٢٤٩) الترمذي ٥/٥٠٤ والدارمي بلفظه ١/٣٣٦ انظر صحيح الترمذي ٢/١٥٧.

واته: خوا گەورەیە. خوایە ئەم مانگە بیهێنەرەوە بە سەرماندا بە ئاشتیو ئاسایش و ئیمان و بە کامەرانیو ئیسلامەتییەوەو بە تەوفیق و یارمەتی دانت بۆ ئەو شتەی پەروەردگار تۆ پێت خۆشەو پێی ڕازیت.(ئەی مانگ)پەروەردگاری ئێمەو تۆش (الله)یە.

## بە ڕۆژوو بوون

١- « پارشێوبکەن چونکە لە پارشێودا بەرەکەت هەیە » (٢٥٠)

٢- ئەگەر بە ڕۆژوو بوویت و جوێنیان پێ دایت( یان شەڕیان پێ فرۆشتی) بڵێ: « إنّي صائم، إنّي صائم » (٢٥١)

واته: من بە ڕۆژووم. من بەڕۆژووم.

٣- « پێغەمبەر (ﷺ)لەسەر چەند دەنکە خورمایەکی نەرم و پێگەیشتوو (رُطَب) بەربانگ دەکردەوە پێش ئەوەی نوێژ بکات. ئەگەر نەبوایە بە خورمای ووشك (تمرات). ئەگەر نەبوایە بە چەند مشتێك لە ئاو » (٢٥٢)

## لە کاتی بەربانگ کردنەوەدا

« ذهب الظَّمأ وابتلّت العروق، وثبت الأجرُ إن شاء الله » (٢٥٣)

---

(٢٥٠) البخاري ١٢٠/٤ ومسلم (١٠٩٥) عن أنس (رضي الله عنه).

(٢٥١) البخاري مع الفتح ١٠٣/٤ ومسلم ٨٠٦/٢.

(٢٥٢) حسن صحيح (صحيح سنن أبي داود ٤٤٨/٢).

(٢٥٣) أخرجه أبوداود ٣٠٦/٢ وغيره. وانظر صحيح الجامع ٢٠٩/٤.

واتە: تینوویەتی ڕۆیشت ودەمارەکان ڕەوینەوەو پاداشتەکەشمان چەسپاوەو مسۆگەرە بە ویستی خوای گەورە.

## نزاو پاڕانەوە ئەگەر لەلای ئەهل و خێزانی ماڵێك بەربانگت کردەوە

« أفطر عندكُمُ الصّائمون. وأكل طعامكُمُ الأبرارُ. وصلّت عليكُمُ الملآئكةُ ». [254]

واتە: یاخوا ڕۆژووەوانان لە لاتان بەربانگ بکەنەوەو خواناس و بێگوناهان لە خواردنتان بخۆن و مەلائیکەت بۆتان بپاڕێنەوە.

## نزاو پاڕانەوەی ڕۆژووەوان ئەگەر خواردنیان هێناو نەیشکاند

« إذا دُعِيَ أحدُكُم فليُجبْ. فإنْ كان صائماً فليُصلِّ. وإنْ كان مُفطِراً فليطعَم ». [255]

---

(254) سنن ابي داود ٣٦٧/٣. وابن ماجه ٥٥٦/١. والنسائي في عمل اليوم والليلة برقم(٢٩٦-٢٩٨) وە دەقەکەی وایە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەی فەرموو کاتێ بەربانگی لە لای خێزانی ماڵێك کردەوە/ وصححه الألباني في صحيح ابي داود ٧٣٠/٢.

(255) مسلم ١٠٥٤/٢.

تێبینی: دووسلە ئەگەر ڕۆژووی سوننەتی گرتبوو وە دەعوەت کرا بۆ خواردنێك کە ڕۆژووەکەی بشکێنێت و خۆی لەسەدا سەربەستە /مسلم ١٩٥٠-١٩٥١ والترمذي وغيره. وانظر إرواء الغليل(٩٦٥).

واته: ئەگەر یەکێك لە ئێوە بانگ کرا بۆ دەعوەتێك با بچێت. ئەگەر بە ڕۆژوو بوو ئەوا با بپاڕێتەوە بۆیان بە بەرەکەت و ئەگەر بە ڕۆژوو نەبوو بابخوات.

## نزاو پاڕانەوەی شەوی قەدر( لیلة القدر )

(( اللهم إنك عفو [كريم] تحب العفو فاعف عني )).[٣٥٦]

واتە: خوایە تۆ لێبووردەو بەخشندەیت و لێبووردنت پێخۆشە. ساخوایە لێم خۆش بەو لێم ببورە.

## ئەگەر نیازی قوربانی کردنت هەبوو

(( اذا دخل العشر فأراد احدكم أن يضحي فلا يمس من شعره ولا من بشره شيئا )).[٣٥٧]

واتە: ئەگەر(دە) ڕۆژی یەکەمی مانگی (ذي الحجة)هات و دەستی پێکردو یەکێك لە ئێوە ویستی وابوو کە قوربانی بکات با هیچ دەست نەدات لە مووو نینۆکی و ئەی نەکاتەوە.

---

(٣٥٦)صحيح (صحيح ابن ماجه ٢/٣٢٨) بدون لفظ ( كريم ) والترمذي ( صحيح الترمذي)(٢٧٨٩) بهذا اللفظ وصححهُ الالباني.

(٣٥٧)مسلم (١٩٧٧) وابوداود (٢٧٩١) والنسائي (٧/٢١١ و ٢١٢) وغيره عن ام سلمة (رضي الله عنها).

## لەکاتی سەربڕین و قوربانیدا

« بِسمِ اللهِ وَاللهُ أكبَرُ، [ اللهُمَّ مِنكَ وَلَكَ]. اللهُمَّ تَقَبَّلْ مِنِّي ».[٣٥٨]

واتە: بە ناوی خواو خوا گەورەیە. خوایە لە تۆوەیەو بۆ تۆیە. خوایە لێم وەرگرەو لێم قبول بکە.

## تەکبیرکردن بۆ جەژنەکان

کاتی تەکبیر کردن لە جەژنی ڕەمەزاندا لە کاتی دەرچوونەوەیە بۆ نوێژ تا نوێژ تەواو دەبێ و لە جەژنی قوربانیشدا لە بەرەبەیانی ڕۆژی عەرەفەوەیە تا کۆتایی ڕۆژەکان( أيامُ التشريق ).[٣٥٩]

بەم شێوازانە:

١- « اللهُ أكبَرُ اللهُ أكبر. لا إلـهَ إلاّ الله. وَالله أكبَـرُ اللهُ أكبَـرُ. وللهِ الحَمدُ ».[٣٦٠]

٢- « اللهُ أكبَرُ اللهُ اكبَرُ اللهُ أكبَر. وَللهِ الحَمدُ. اللهُ أكـبرُ وَأجَـلّ. اللهُ أكبَرُ على ما هَدانا ».[٣٦١]

---

(٣٥٨) مسلم ١٥٥٧/٣ والبيهقي ٢٨٧/٩ ومابين المعكوفين للبيهقي ٢٨٧/٩ وغيره والجملة الأخيرة سقتها بالمعنى من رواية مسلم.

(٣٥٩) انظر(سلسلة الاحاديث الصحيحة)(١٧٠) ومجموع الفتاوى ٢٢٠/٢٤ وانظر سبل السلام ٧١/٢-٧٢.

(٣٦٠) رواه ابن ابي شيبة ١٦٨/٢ بإسناد صحيح موقوفاً على ابن مسعود(ﷺ). وصححَهُ الألباني في الإرواء ١٢٥/٣.

(٣٦١) رواه البيهقي ٣١٥/٣ وسنده صحيح موقوفاً على ابن عباس (رضي الله عنهما).

واتە: خوا گەورەیە، خوا گەورەیە، خوا گەورەیەو ستایش بۆ خوایە. خوا گەورەیەو خاوەنی شکۆو ڕێزە. خوا گەورەیە لەسەر ئەوەی ڕێنمایی کردووین.

٢- «اللهُ أكبَرُ. اللهُ أكبَرُ. اللهُ أكبَرُ كَبيراً». (٣٦٢)

تێبینی: تەکبیر کردن لە جەژن دا لە هەموو کاتەکانی‌دا (کە دیاری کراوە) سوننەتەو تایبەت نییە بە دوای نوێژە فەرزەکانەوەو بەس. وە دروستە کە دەنگی هەڵبڕێ.

# جەژنە پیرۆزە کردن

«تَقَبَّلَ اللهُ مِنّا وَمِنكَ». (٣٦٣)

واتە: خوا لە ئێمەو لە تۆشی قبوڵ بکات.

# ڕۆژووە سوننەتەکان

١- شەش ڕۆژ لە مانگی شەوال(شەشەلان): پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: «هەر کەسێك مانگی ڕەمەزان بگرێت و بە دوایدا شەش ڕۆژ لە مانگی شەوال بگرێت وەکو ڕۆژووی ساڵەکە وایە». (٣٦٤)

---

(٣٦٢) أخرجه عبدالرزاق ومن طريقه البيهقي في (السنن الكبرى) ٢/٣١٦ بسند صحيح.

(٣٦٣) قال احمد: اسناد حديث ابي امامة جيد. وانظر (الجوهر النقي) ٣/٣٢٠ وقال السيوطي في (الحاوي) ٨١/١: إسناده حسن. وقال ابن حجر: وروينا في (المحامليات) بإسناد حسن عن جبير ابن نفير من أهل الصحابة أيضاً / (فتح الباري) ٤٤٦/٢.

(٣٦٤) مسلم ٨٢٢/٢ وغيره.

٢- (نۆ)ڕۆژی یەکەمی مانگی( ذي الحِجّة) نۆمینەی حاجیان.[٣٦٥]

٣- مانگی موحەڕەم: (( چاکترین ڕۆژوو دوای ڕەمەزان مانگی موحەڕەمە...))[٣٦٦]

٤- مانگی شەعبان.[٣٦٧]

٥- دووشەممەو پێنج شەممەی هەموو هەفتەیەك.[٣٦٨]

٦- ڕۆژە سپییەکان(أيامُ البيض) واتە: (١٣،١٤،١٥)ی هەموو مانگێك(مەبەست مانگی کۆچییە).[٣٦٩]

٧- ڕۆژ نا ڕۆژێك: (( لە ڕۆژووی داود پێغەمبەر(عليه الصلاة والسلام) چاکتر نییە کە نیوەی ساڵی دەگرت. ڕۆژێك بگرەو ڕۆژێك بشکێنە )).[٣٧٠]

---

(٣٦٥) أبوداود ٢/٨١٥ وغيره وهو حديث حسَن.

(٣٦٦) مسلم ٢/٨٢١ وغيره.

(٣٦٧) البخاري ٤/٢١٣ ومسلم ٢/٨١١.

(٣٦٨) رواه ابو داود(٢٤٣٦) والترمذي والنسائي وابن ماجه بألفاظ مختلفة وهو حديث صحيح. انظر صحيح ابي داود(٢١٢٨). والإرواء ٤/١٠٥-١٠٦.

(٣٦٩) مسلم ٢/٨١٨ وغيره عن ابي قتادة. تێبینی: بۆیە پێی ئەوترێن (أيامُ البيض) چونکە مانگ لەو سێ شەوەیدا زۆر ڕووناکی دیارە.

(٣٧٠) البخاري ٤/٢٢٤ ومسلم ٢/٨١٧.

تێبینی: لەسەرمان بە مەرجێك شەرع ڕازی بێت پێی بۆ نەکەوێتە ئەو ڕۆژانەی کە دروست نییە بە ڕۆژوو بێت تیایدا وەك: ( جەژن- أيام التشريق - ڕۆژی هەینی بە تەنها - ڕۆژی شەممە(مەگەر بۆ فەرز بێت) - ...هتد).

٨- ڕۆژووی عەرەفە: « ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە خوای گەورە دەیکاتە مایەی سڕینەوەی گوناهی ساڵێکی پێشووی وە ساڵێکی دوایی »(٢٧١)

٩- ڕۆژووی عاشورا واتە(١٠)ی مانگی مەحەرەم: «... وە ڕۆژووی ڕۆژی عاشورا خوای گەورە گوناهی ساڵێکی پێشوی پێ دەسڕێتەوە»(٢٧٢)

## لە کاتی توورەبووندا

بڵێ: « أعوذُ بالله مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيمِ »(٢٧٣)

واتە: پەنا دەگرم بە خوای گەورە لە شەیطانی نەفرەت لێکراوو دوورخراوە لە ڕەحمەتی خوا.

## ئەگەر کەسێکی تووش بوو بە بەڵایەکت بینی

بڵێ: « الحمدُ لله الَّذي عافاني ممَّا ابتلاكَ به، وفَضَّلني على كَثيرٍ ممَّن خلقَ تفضيلاً »(٢٧٤)

واتە: ستایش بۆ ئەو خوایەی منی پاراست لەوەی تووشی تۆی کردوەو فەزڵی منی داوە بەسەر زۆرێك لە دروست کراوەکانیدا.

(٢٧١) مسلم ٢/٨١٨.

(٢٧٢) مسلم ٢/٨١٨. پێغەمبەر(ﷺ) دەیەم ڕۆژی گرت و فەرمووی ئەگەر ساڵێکی تر بمێنم نۆیەمیش دەگرم، بەڵام ئەوەبوو لە ساڵی داهاتوودا وەفاتی کرد. وە دەیفەرموو(ڕۆژی عاشورا بە ڕۆژووبن و موخالەفەی جولەکە بکەن بەوەی لەگەڵیدا ڕۆژێك لە پێشییەوە یان لە دواییەوە بە ڕۆژوو بن). رواه مسلم(١١٣٢).

(٢٧٣) البخاري ٧/٩٩ ومسلم ٤/٢٠١٥.

(٢٧٤) هەرکەسێ ئەمە بڵێ ئەو بەڵایەی تووش نابێ/ الترمذي ٥/٤٩٤ و ٥/٤٩٣ وانظر صحيح الترمذي ٣/١٥٣.

# ووتاری پێنویستی( خُطبَةُ الحاجة )

«إنّ الحمد لله نحمَدُهُ ونستعينُهُ نستغفرُهُ، ونعوذُ بالله مِنْ شُــرورِ أنفُسِنا وسيِّئات أعمالنا، مَنْ يهده اللهُ فلا مُضلَّ لهُ، ومَنْ يُضلل فــلا هاديَ لهُ، وأشهدُ أن لا إله إلاّ الله وحدَهُ لا شريكَ لهُ، وأشــهَدُ أن محمّداً عبدُهُ ورسولُهُ».

﴿ ياأيـــُّها الَّـــذينَ آمنُــوا اتّقُــوا الله حَــقَّ تقاتِــهِ ولا تـــمُوتُنَّ إلاّ وأنتُم مُسلِمون ﴾ (آل عمران: ١٠٢)

﴿ ياأيـــُّها النّاسُ اتقوا ربّكم الّذي خلَقَكم مِنْ نفسٍ واحدة وخَلَقَ منها زوجَها وبَثَّ منهُما رجالاً كثيراً ونساءاً واتّقوا الله الّذي تَساءَلونَ بهِ والأرحامَ إنّ الله كانَ عَلَيكُم رَقيباً ﴾ ( النساء/١)

﴿ ياأيـــُّها الذينَ آمنوا اتّقوا الله وقولوا قولاً سَديداً يُصلِحْ لَكُم أعمالَكُم ويَغفِر لَكُم ذُنوبَكُم ومَنْ يُطِعِ الله ورَسولَهُ فَقَدْ فازَ فَوزاً عظيماً ﴾.

( الأحزاب: ٧٠-٧١)

أما بَعْدُ فإنَّ أصدَقَ الحَديثِ كتــابُ الله، وخَــيرَ الهَــدي هَــديُ

مُحَمَّد(ﷺ)، وَشَرَّ الأمُور مُحدَثاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثة بِدْعَة، وَكُلَّ بِدعَة ضَلالَة، وَكُلَّ ضَلالَة فِي النَّار » (٣٧٥)

واته: سوپاس و ستایش بۆ خوایه، ستایشی دهکهین و داوای کۆمهکیو لێخۆش بوونی لێ دهکهین. وه پهنا دهگرین به خوا له خراپی دهروون و کردهوهکانمان، ههر کهسێك خوا ڕێنومایی بکات گومڕا کهری نییهو کهسێك گومڕا ببێت ڕێنمایی کهری نییه، وه شایهتی دهدهم که هیچ پهرستراوێك نییه به ههق جگه له(الله). تاکی بێ هاوبهشه، وه شایهتی دهدهم که موحهممهد(ﷺ) بهندهو نێردراوی خوایه.

( ئهی ئهوانهی ئیمانتان هێناوه تهقوا خوای بکهن به تهقوایهکی ههق و مهشمرن به موسڵمانێتی نهبێت {واته: بهردهوام پارێزگاری ئیسلامهتی خۆتان بکهن } ). (٣٧٦)

---

(٣٧٥) ئهمه بریتوییه له دهقی ئهو ووتاری پێویستییهی که پێغهمبهر(ﷺ) دهیکرده دهستپێکی ووتارهکانیو فێری هاوهڵهکانیشی دهکرد. ئهم ووتاره(شهش) که له هاوهڵان (ڕهزای خوایان لێ بێت) گێڕاویانهتهوهو کۆمهڵێك لهپێشهوایانی فهرموونه له(مصنف)ه کانیاندا دهریان هێناوه لهوانه: إمام احمد(٥/٣٧٢) ومسلم له(صحيحه)(٢/٥٩٢/٨٦٧) وابوداود والنسائي وابن ماجه والحاكم والطيالسي وله( صحيح النسائي) ( ١٣٣١) وله(المشكاة) (٣١٤٩) و ( الكلم الطيب) ( ٢٠٥).

(٣٧٦) مختصر تفسير ابن كثير(١/٣٠٣).

(ئەی خەڵکینە تەقوای پەروەردگارتان بکەن و پەرستشی بۆ ئەنجام بدەن، ئەو خوایەی کەوا بەدی هێناون لە یەك نەفس (کە ئادەمە (علیه الصلاة والسلام)). وە لەو نەفسە خێزانەکەی بۆدروست کرد(کە حەواء)ە. وە لەو دووانە چەندەها پیاوان و ئافرەتانی ڕەنگ و زووبان جیاوازی دروست کردو خستەوە. وە تەقوای ئەو خوایە بکەن کە داوای پێدەکەن و لێی دەپاڕێنەوە، وە پارێزگاری سیلەی ڕەحم بکەن لە نێوانتاندا، بە ڕاستی خوای گەورە ئاگادارە بەسەرتانەوە). (٣٧٧)

( ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە تەقوای خوا بکەن و وتەیەکی ڕاست و تەواو بڵێن تا خوای گەورە کارەکانتان بۆ چاك بکات بەرەو صەواب و لە گوناهەکانتان دەبورێت، وە هەر کەسێك گوێ ڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی(ﷺ) بکات بە ڕاستی بردوویەتییەوە بە بردنەوەیەکی گەورە). (٣٧٨)

پاشان ڕاسترین ووتەو فەرموودە کیتابەکەی خوایەو چاکترین ڕێنموویی ڕێنومایی پێغەمبەرە(ﷺ)، وە خراپترینی کاروبارەکان تازە گەرییەکانێتی، وە هەموو تازەگەرییەکیش لە دینـدا (کە تیایدا نەبێت) داهێنراوە، وە هەموو داهێنراوێکیش گومراییەو هەموو گومراییەکیش لە ئاگردایە.

---

(٣٧٧) مختصر تفسير ابن كثير(١/٢٥٤).

(٣٧٨) مختصر تفسير ابن كثير(٣/١١٦).

# ئەو ذیکرەی لە دانیشتگا( مەجلیس ) دا دەووترێ

لە ابن عمرەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێش ئەوەی هەستێ لە مەجلیسێکدا دەیانژمارد سەد جار دەیفەرموو:

« رَبِّ اغفرْ لِي وَتُبْ عَلَيَّ إِنَّكَ أنتَ التَّوابُ الغفور ».[٣٧٩]

واتە: پەروەردگار لێم خۆش بەو گەڕانەوەم لێ وەربگرە بەڕاستی تۆ تۆبە وەرگری لێ بووردەیت.

# کەفارەتی دانیشتگا( مەجلیس )

« سُبحانَكَ اللهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أشهَدُ أنْ لا إله إلاّ أنـتَ، أسـتغفِرُكَ وَأتوبُ إلَيكَ ».[٣٨٠]

واتە: خوایە پاك و بێگەردیو ستایش بۆ تۆیە. شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لە تۆ، داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لات.

---

(٣٧٩) الترمذي وغيره وانظر صحيح الترمذي ٣/١٥٣ وصحيح ابن ماجه ٢/٣٢١ واللفظ للترمذي.

(٣٨٠) هەرکەسێك لە مەجلیسێکدا دابنیشێ و زۆر هەڵەو قسەی بێبایەخی تێدا بکات و پێش ئەوەی لەو مەجلیسە هەستێ بڵێ...(فەرموودەکە).. ئیلا خوا لە تاوانی ئەو مەجلیسەی خۆشی دەبێ/ أخرجه أصحاب السنن وهو صحيح، وانظر صحيح الترمذي ٣/١٥٣. وەهەروەها کە عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) لە هیچ مەجلیسێکدا دانەنیشتووەو قورئانی نەخوێندووەو نوێژێکی نەکردووە ئیلا ئەوەی بەم ووشانە کۆتایی پێهێناوە... فەرموودەکە...) أخرجه النسائي في عمل اليوم والليلة برقم (٣٠٨) وأحمد ٦٠/٧٧ وصحّحَهُ الدكتور فاروق حمادة في تعليقه لعمل اليوم والليلة للنسائي ص/ ٢٧٣.

# پاڕانەوەی دوای دانیشتن

« اللهُمَّ اقسِمْ لَنا مِنْ خشيَتِكَ ما تَحُولُ به بَيْنَنا وَبَيْنَ مَعاصِيكَ. وَمِنْ طاعَتِكَ ما تُبَلِّغُنا به جَنَّتَكَ. وَمِنَ اليَقينِ ما تُهَوِّنُ به عَلَينا مَصائِبَ الدُّنيا. اللهُمَّ مَتِّعْنا بأسماعِنا وَأبْصارِنا وَقُوَّاتِنا ما أحيَيْتَنا. وَاجعَلْهُ الوارِثَ مِنّا. وَاجعَلْ ثأرَنا عَلى مَنْ ظَلَمَنا وَانصُرْنا عَلى مَنْ عادانا. وَلا تَجْعَلْ مُصيبَتَنا في دِينِنا. وَلا تَجْعَلِ الدُّنيا أكبَرَ هَمِّنا وَلا مَبْلَغَ عِلْمِنا. وَلا تُسَلِّط عَلَينا مَنْ لا يَرْحَمُنا ».(٣٨١)

واتە: خوایە لەترسی خۆت ئەوەندەمان بەسەردا بەش بکە کە دوورمان بخاتەوە لە سەرپێچی کردنت. وە لە گوێ ڕایەڵی خۆت ئەوەندەمان پێببەخشە کە بمانگەیەنێتە بەهەشتەکەت. وە لە دڵنیایی ئەوەندەمان پێببەخشە کە بەڵاو موسیبەتەکانی دنیامان لا ئاسان بکات. خوایە کامەرانمان بکە بە بیستن و بینین و هێزەکانمان تا دەمان ژیێنیەو لەدوای خۆمان بە میرات بەجێی بهێڵە بۆ کەس وکارو نەوەکانمان. وە ڕق و تووڕەییمان ڕوو پێ بکەرە ئەو کەسەی ستەمی لێکردووین و سەرمان بخە بەسەر ئەوەدا دوژمنایەتیمان دەکات. وە بەڵاو موسیبەتمان مەخەرە دینەکەمانەوەو دنیا مەکە بە گەورەترین خەفەتمان و مەیکەرە ئەوپەڕی زانستمان و خوایە کەسێك دەسەڵاتدار مەکە بەسەرماندا کە ڕەحممان پێناکات و بەزەیی نایەتەوە پێماندا.

(٣٨١) الترمذي ٥/٥٢٨ والحاكم ١/٢٥٨ وصححه ووافقه الذهبي. وابن السني برقم (٤٤٦) وانظر صحيح الترمذي ٣/ ١٦٨ وصحيح الجامع ١/٤٠٠.

## ئەگەر کەسێك پێی ووتی
## خوا لێت خۆش بێت ( غَفَرَ اللهُ لَكَ )

لە(عبدالله ی کوڕی سرجس)ەوە دەفەرموێت: هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) و لەو خواردنەکەیم خواردو پێم ووت: ( غَفَرَ اللهُ لَكَ يا رسولَ الله) خوا لێت خۆش بێت ئەی پێغەمبەری خوا. ئەویش فەرمووی: « وَلَكَ » واتە: وە لە تۆش خۆش بێت. [٢٨٢]

## ئەگەر کەسێك چاکەیەکی لەگەڵدا کردیت

(هەر کەسێك چاکەیەکی لەگەڵدا کراو بە بکەری چاکەکەی ووت: « جَزاكَ اللهُ خَيراً » واتە: خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە. ئەوا ئەوپەڕی سوپاس و ستایشی کردووە). [٢٨٣]

## ئەو زیکرەی کە خوا دەتپارێزێ بەهۆیەوە لە( دەججال )

« مَنْ حَفظَ عَشرَ آياتٍ مِنْ أوَّلِ سُورَةِ الكَهْفِ عُصِمَ مِنَ الدَّجَّالِ ». [٢٨٤]

---

(٢٨٢) أحمد ٥/٨٢ والنسائي في عمل اليوم والليلة ص (٢١٨) برقم (٤٢١) تحقيق الدكتور فاروق حمادة.

(٢٨٣) أخرجه الترمذي برقم (٢٠٣٥) وانظر صحيح الجامع (٦٢٤٤) وصحيح الترمذي ٢/٢٠٠.

(٢٨٤) مسلم ١/٥٥٥. وە لەریوایەتێکدا: « مِن آخرِ الكَهف » . واتە: لەکۆتایی سورەتی ( الكَهف ) ١/٥٥٦.

واتە: هەر کەسێك(ئە) ئایەتی سەرەتای سوورەتی(الكَهْف) لەبەریکات لە دەجال دەپارێزێت.

وە پەنا گرتن بە خوای گەورە لە ئاشووبەی دەجال لە دوای تەحییاتی کۆتایی هەموو نوێژێکەوە. (٢٨٥)

## ئەگەر کەسێکت لەبەر خوا خۆش ویست

پێی بڵێ: « إنّي أحِبُّكَ لِي اللهِ ». (٢٨٦)

واتە: من لەبەر خوای گەورە تۆم خۆش دەوێت.

## ئەگەر مۆسلمانێك پێی ووتی من لەبەر خوا خۆشم دەوێیت

پێی بڵێ: « أحَبَّكَ الَّذي احبَبْتَني لَهُ ».(٢٨٧)

واتە: ئەو خوایە خۆشی بووێیت کە منت لەبەر ئەو خۆش دەوێ.

---

(٢٨٥) بڕوانە فەرموودەی یەکەم و دووەم و سێیەمی لاپەڕە (٨٧) ، (٨٨).

(٢٨٦) أخرجه ابوداود ٤/٣٣٣ وحسّنه الألباني في صحيح ابي داود ٢/٩٦٥.

(٢٨٧) أخرجه ابوداود ٤/٣٣٣. وحسنه الألباني في صحيح ابي داود ٢/٩٦٥.

## ئەگەر موسلمانێك پێكەنی

پێی بڵێ: « اضحَكَ اللهُ سِنَّكَ ». [388]

واتە: یاخوا هەردەم لە پێكەنین و دڵخۆشیدا بیت.

## ئەگەر كەسێك پارەو سامانی خستە ڕووت

پێی بڵێ: « بارَكَ اللهُ لَكَ في أهلِكَ ومالِكَ ». [389]

واتە: خوای گەورە لەمەو بەرەكەت بخاتە خێزان و ماڵ و سامانتەوە.

## نزاو پاڕانەوە بۆ خاوەن ماڵ لە كاتی قەرز گەڕاندنەوەدا

« بارَكَ اللهُ لَكَ في أهلِكَ ومالِكَ إنَّما جَزاءُ السَّلَفِ الحَمْدُ وَالأداءُ ». [390]

واتە خوا بەرەكەت بخاتە ناو خێزان و سامانتەوە. بە ڕاستی پاداشتی قەرز دان سوپاس و ستایش كردن و قەرزگەڕاندنەوەیە وەك خۆی.

---

(388) رواه البخاري الفتح(٦٣٨٢) ومسلم في فضائل الصحابة(٢٣٩٦) عن سعد بن أبي وقاص رضي الله عنه.

(389) البخاري مع الفتح ٨٨/٤.

(390) أخرجه النسائي في عمل اليوم والليلة ص (٣٠٠) وابن ماجه ٨٠٩/٢ وانظر صحيح ابن ماجه ٥٥/٢. وفي روايته: «... إنما جزاء السلف الوفاء والحمد» حديث حسن. واتە:... پاداشتی قەرز گەڕاندنەوە وەفاو سوپاس كردنە لەسەری.

## نزاو پاڕانەوەی ترسان لە هاوبەش دانان بۆ خوا( الشّرك )

« اللّهُمَّ إِنّي أَعوذُ بِكَ أَنْ أُشْرِكَ بِكَ وَأَنا أَعْلَمْ، وَأَسْتَغْفِرُكَ لِما لا أَعْلَمُ ». [391]

واتە: خوایە پەنات پێ دەگرم لەوەی کە هاوبەشت بۆ دابنێم و ئاگادار بم پێی، وە داوای لێخۆشبوونت لێدەکەم لەوەی کە نایزانم و ئاگادار نیم پێی.

## کەفارەتی سوێند خواردن بە غەیری خوا

( هەرکەسێ سوێندی خوارد وتی بە لات و عوزا [392] با بڵێ: « لا إلهَ إلاّ الله » وە هەر کەسێک بە هاوڕێکەی ووت: وەرە با قومارت لەگەڵ بکەم با خێرێک بکات). [393]

---

(391) أحمد ٤/٤٠٣ وغيره وانظر صحيح الجامع ٣/٢٣٣ وصحيح الترغيب والترهيب للألباني ١/١٩.

(392) ئەم دووانە ناوی دوو بت و پەرستراوی سەردەمی نەفامی بوونە بە بێگومان سوێند خواردن بە هەر شتێکی تر (جگە لەخوای پەروەردگار) هەمان حوکمی هەیە دروست نییە و هەمان کەفارەتی دەوێ.

(393) البخاري ٤٦٧/١١ ومسلم (١٦٤٧) عن أبي هريرة (رضي الله عنه).

## چی دەڵێ ئەگەر دیارییەك یا خێرێکی دا بە کەسێك و ئەویش پاڕایەوە بۆی یان ئەگەر یەکێ پێی ووتی: ( بارَكَ اللهُ فيكَ )

عائیشە(ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: مەڕێکیان بە دیاری هێنا بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەویش فەرمووی: بەشی بکە. وەعائیشە(ڕەزای خوای لێ بێت) کاتێك خزمەتکارەکەی دەگەڕایەوە لە ماڵەکان دەیفەرموو: وتیان چی؟ دەیفەرموو: دەیانووت: ( بارَكَ اللهُ فيكم ) واتە: خوا بەرەکەت بخاتە ناوتان. عائیشەش دەیفەرموو: « ( وَفيهِم بارَكَ اللهُ ) نَرُدُّ عَلَيهِم مِثلَ ماقالوا وَ يَبقى أجرُنا لَنا ». (٣٩٤)

واتە: خوای گەورە بەرەکەت بڕژێ بەسەر ئەوانیشدا، چی‌یان ووت پێیان دەڵێینەوە وە پاداشتەکەشمان بۆ خۆمان دەمێنێتەوە.

## پاڕانەوەی بە دڵ دا هاتنی ڕەشبینی‌و شوومی( الطِّيَرة )

« اللّهُمَّ لا طَيرَ إلاّ طَيرُكَ. ولاخَيرَ إلاّ خَيرُكَ. وَلا إلهَ غَيرُكَ ». (٣٩٥)

---

(٣٩٤) أخرجه ابن السني ص (١٣٨) برقم (٢٧٨) وانظر الوابل الصيب لابن القيم ص (٣٠٤) تحقيق بشير محمد عيون.

(٣٩٥) أحمد ٢/٢٢٠ وابن السني برقم ٢٩٢ وصحّحَه الالباني في الاحاديث الصحيحة ٣/٥٤ رقم (١٠٦٥) / بەڵام گەشبینی (الفال) پێغەمبەر(ﷺ) پێی خۆش بووە، بۆیە ڕوشەیەکی خۆشی لەکابرایەك بیست و پێی خۆش بوو فەرمووی: « أخذنا فألَكَ من فيك » واتە: ووشەیەکی گەشبینیمان لە دەمی خۆتەوە وەرگرت)/ أبو داود واحمد. وصحّحَهُ الالباني في الصحيحة ٢/٣٦٣ عند ابي الشيخ في أخلاق النبي(ﷺ) ص (٢٧٠).

## پاڕانەوەی سوار بوونی وولاغ یان ئامێری گواستنەوە

« بِسمِ اللهِ. الحَمدُ للهِ. ﴿ سُبحانَ الّذي سَخّرَ لَنا هذا وَما كُنّا لَهُ مُقرِنينَ ° وإنّا إلى ربِّنا لَمُنقَلِبون ﴾ الحَمدُ للهِ. الحَمدُ للهِ. الحَمدُ للهِ. اللهُ أكبر. اللهُ أكبر اللهُ أكبرُ. سُبحانَكَ اللهُمَّ إنّي ظَلَمْتُ نَفسي فاغفِرْ لي فإنّهُ لا يَغفِرُ الذُّنوبَ إلاّ أنتَ ». (٣٦٦)

واتە: بە ناوی خوا. ستایش بۆ خوا. پاکیو بێ کەم و کورتیو گەورەیی بۆ ئەو خوایەی ئەمەی بۆ ژێربار خستوین و ئێمە دەستەڵاتمان نەبوو بە سەریدا، وە ئێمە(لە ڕۆژی دواییدا) بۆلای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە. سوپاس و ستایش بۆ خوا... خوا گەورەیە... پاکیو بێ کەم و کورتیو گەورەیی بۆ تۆیە خوایە من ستەمم لە نەفسی خۆم کردووەو لێم خۆش بە. بەڕاستی کەس لە گوناه خۆش نابێ جگە لە تۆ.

## نزاو پاڕانەوەی چوون بۆ گەشت (سەفەر)

١- « اللهُ أكبَرُ. اللهُ أكبَرُ. اللهُ أكبَرُ. ﴿ سُبحانَ الّذي سَخّرَ لَنا هذا وَما كُنّا لَهُ مُقرِنينَ ° وَإنّا إلى رَبِّنا لَمُنقَلِبون ﴾ اللهُمَّ إنّا نَسألُكَ في سَفَرِنا هذا البِرَّ وَالتّقوَى. وَمِنَ العَمَلِ ما تَرضَى.

---

(٣٦٦) ابوداود ٣/٣٤ والترمذي ٥/٥٠١ وانظر صحيح الترمذي ٣/١٥٦.

اللهُمّ هَوِّنْ عَلَينا سَفَرَنا هذا واطْوِ عَنا بُعْدَهُ. اللهُمّ أنتَ الصّاحِبُ في السَّفَرِ. وَالخَليفَةُ في الأهلِ. اللهُمّ إنّي أعوذُ بِكَ مِنْ وَعثاءِ السَّفَرِ. وَكآبَةِ المَنْظَرِ. وَسُوءِ المُنقَلَبِ في المالِ والأهلِ ».

وە ئەگەر گەڕایەوە لەسەفەر دەیلێتەوەو ئەمەی بۆ زیاد دەکات:

« آيبونَ. تائبونَ. عابدونَ. لِرَبِّنا حامدونَ ». (٢٩٧)

واتە: خوا گەورەیە ... پاکیو بێگەردی بۆ ئەو خوایەی ئەمەی بۆ ژێر بار خستووینو ئێمە دەستەلآتمان نەبوو بەسەریدا، وە ئێمە(لە ڕۆژی دوایی‌دا)بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە. خوایە لەم گەشتەماندا داوای کردەوەی چاکو ڕەفتاری جوانو تەقوات لێ‌دەکەینو داوای کارێکت لێ دەکەین کە پێی ڕازی بیت. خوایە ئەم گەشتەمان بۆ ئاسان بکەو دووری‌یەکەیمان بۆ نزیك بخەرەوە. خوایە تۆ ئاگات لێمانە لە گەشتەکەماندا‌و تۆ پارێزەری کەس‌وکارمانی(کە جێمان هێشتون). خوایە پەنات پێ ئەگرم لە ناڕەحەتیو ناسۆری گەشتو غەمباری ڕوالەت و شتێك کە غەمبارم بکات و خراپ گەڕانەوە بۆ ماڵو خێزان (بەوەی کە شتێکیان لێ‌ببینم دڵ تەنگم بکات)... گەڕاینەوە لە بێ‌ئاگایی (بە ویستی خوا). بەتەوبەکردنو پەرستشەوە، ستایشی پەروەردگارمان دەکەین.

---

(٢٩٧) مسلم ٢/٩٩٨.وفي رواية:(وآيبون إن شاء الله...)». وە بڕوانە تەفسیری ئایەتی (١٢- ١٣-١٤)ی سورەتی(الزخرف).

٢- لە ئەبی هورەیرەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر سەفەری بکردایەو سواری ووڵاغەکەی ببوایە دەیفەرموو: « اللهُمَّ أنتَ الصّاحِبُ في السَّفَرِ والخَليفَةُ في الأهلِ. اللهُمَّ اصحَبنا بنُصحِكَ. واقلِبنا بذِمَّةٍ. اللهُم ازوِ لَنا الأرضَ. وَهوِّن عَلَينا السَّفَر، اللهُمَّ إنّي أعوذُ بِكَ مِن وَعثاءِ السَّفَرِ. وَكآبةِ المُنقَلَب ».(٢٩٨)

واتە: ئەی خوایە تۆ ئاگادارمی لە گەشتەکەمداو ئاگاداری کەسوکارمی. خوایە بە ئامۆژگاری خۆت ئاگات لێم بێت و بە چاودێری خۆت بمانگێڕەوە مەنزڵگا. خوایە زەویمان بۆ بێنەوە یەك و گرانیو ناڕەحەتی گەشتمان لەسەر ئاسان بکە، خوایە من پەنات پێدەگرم لە ئاسوێی گەشت و بە غەمباری گەڕانەوە.

## ئەوشتانەی پەنا دەگری بە خوای گەورەلێی لە گەشتدا

لە عبدالله ی کوڕی سرجس(ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێ: ( كان رسول الله(ﷺ) إذا سافرَ يَتَعَوَّذُ من وَعثاءِ السَّفَرِ وَكآبةِ المُنقَلَبِ، وَالحورِ بعْدَ الكور. وَدعوة المظلوم، وَسوء المنظر في الأهلِ وَالمالِ).(٢٩٩)

---

(٢٩٨)رواه الترمذي برقم(٣٤٣٨) و صححهُ الألباني في صحيح الترمذي برقم(٢٧٣٤).
(٢٩٩)رواه مسلم ١١١/٩ والنسائي ٢٧٢/٨.

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر سەفەری بکردایە پەنای دەگرت بەخوای گەورە لە ناسۆری گەشت و خەمباری پرۆڵەت و گەڕانەوە بە خەمبارییەوە لە نوقسانی دوای زیادە( یان لە خراپ بوونی کاروبارمان دوای چاك بوونی)[100] وە لە پاڕانەوەی ستەم لێکراو خراپ گەڕانەوە بۆ ناو کەس و کارو ماڵ و سامان.

## نزاو پاڕانەوەی چوونە ناو گوندێك یان شارێك

«اللهُمَّ رَبَّ السَّمواتِ السَّبعِ وَما أظْلَلْنَ. وَرَبَّ الأرضينَ السَّبعِ وَما أقْلَلْنَ. وَرَبَّ الشَّياطينِ وَما أضلَلْنَ. وَرَبَّ الرِّياحِ وَما ذَرَيْنَ. أسألُكَ خَيرَ هذهِ القَريَةِ. وَخَيرَ أهلِها. وَخَيرَ ما فيها. وأعوذُ بِكَ مِنْ شَرِّها. وَشَرِّ أهْلِها. وَشَرِّ ما فِيها».[101]

واتە: خوایە پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکان و ئەوەی سێبەری بۆ دەکات، وە پەروەردگاری حەوت چینەکەی زەوی و ئەوەی هەڵی گرتووە. پەروەردگاری شەیطانەکان و ئەوانەی گومڕایان کردوون. پەروەردگاری (با)کان و ئەوەی لەگەڵ خۆیاندا دەیبەن. داوای خێر و چاکەی ئەم گوندەو چاکەی خەڵکەکەی و ئەو چاکەیەت لێ دەکەم کە تیایدایەو پەنات پێ دەگرم لەخراپەکەی و خراپەی خەڵکەکەی و خراپەی ئەوەی تیایەتی.

---

(100) انظر النهاية لابن الأثير ١/٤٥٨.

(101) الحاكم وصَحَّحَهُ وَوافَقَهُ الذهبي ٢/١٠٠ وابن السني برقم (٥٢٤) وحَسَّنَهُ الحافظ في تخريج الأذكار. قال ابن باز: و رواه النسائي بإسناد حسن. انظر تحفة الأخيار ص (٣٧). وصحيح الكلم الطيب ص ٦٧.

# نزای چوونە بازاڕ

« لاَ إلهَ إلاَّ اللهُ وَحدَهُ لا شريكَ لَهُ. لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمـدُ. يُحيـي وَيُميتُ. وَهـوَ حـيٌّ لا يمـوتُ. بِيَـدِهِ الخَـيرُ وَهـوَ عَلىٰكُـلِّ شيءٍ قَدير ». (٤٠٢)

واتـە: هـیچ پەرسـتراوێك نییـە بـە هـەق جگـە لـە(الله) تـاكی بێهاوەڵەو موڵك و ستایش بۆ ئەوەو ئەژیەنێ‌و ئەمرێنێ‌و خۆی زیندووەو هەرگیز نامرێ. خێرو چاكە بەدەست ئەوەو بەسەر هەموو شتێكدا بە تواناو دەستەڵاتدارە.

# لە كاتی هەڵدێرانی نامێری سواری یان سەرسم دانێدا

بڵێ: « بِسمِ اللهِ ». (٤٠٣)

واتە: بەناوی خوای گەورە.

---

(٤٠٢) هەركەسێ ئەمە بڵێ هەزار هەزار(ملیۆنێك) چاكەی بۆ دەنووسرێ و هەزار هەزار گوناهی لێ دەسڕدرێتەوە و هەزار هەزار پلە بەرزدەكرێتەوە لای خوای گەورە(وە ماڵێكی لە بەهەشت دا بۆ دروست دەكرێت) / الترمذي ٢٩١/٥ والحاكم ٥٣٨/١ وحسنه الالباني في صحيح ابن ماجه ٢١/٢ وفي صحيح الترمذي ١٥٢/٣. وانظر ترتيب احاديث صحيح الجامع الصغير ٤١٣/٢ رقم(١٧).

(٤٠٣) ابوداود ٢٩٦/٤ وصححه الالباني في صحيح ابي داود ٩٤١/٢.

# نزاو پاڕانەوەی ئەو کەسەی دەچێت بۆ گەشت

# (المُسافِر) بۆ جێماو

« اسْتَودِعُكُمُ اللهَ الَّذي لا تَضيعُ وَدائِعُهُ ». [404]

واتە: ئەتان سپێرم بەو خوایەی کە سپاردە زایە ناکات.

# پاڕانەوەو ئامۆژگاری جێماو

# بۆ ئەو کەسەی دەچێت بۆ گەشت

١- « أَسْتَودِعُ اللهَ دينَكَ، وَأَمانَتَكَ، وَخَواتيمَ عَمَلِكَ ». [405]

واتە: دین و ئەمانەت و کۆتایی کردەوەکانت دەسپێرم بە خوای گەورە.

٢- « زَوَّدَكَ اللهُ التَّقوى، وَغَفَرَ ذَنْبَكَ، وَيَسَّرَ لَكَ الخَيرَ حَيْثُ ما كُنْتَ ». [406]

واتە: خوا تەقوات زیاد بکات و لە گوناهت خۆش بێت وخێرو چاکەت بۆ ئاسان بکات لە هەر جێگەو شوێنێك بوویت.

(٤٠٤) أحمد ٢/٤٠٣ وابن ماجه ٢/٩٤٣ وانظر صحيح ابن ماجه ٢/١٣٣ وصحيح الجامع(٩٥٨).

(٤٠٥) أحمد ٢/١٩٩ و الترمذي (٣٤٤٣) والنسائي في عمل اليوم والليلة (٥٢٣) وصَحّحَهُ الألباني في صحيح سنن الترمذي برقم(٢٧٣٨) وانظر صحيح الترمذي ٢/١٥٥ وە لە ڕیوایەتێکە دا « ...... وَآخِرُ عَمَلِكَ ».

(٤٠٦) الترمذي. وانظر صحيح الترمذي ٢/١٥٥.

٣- له ئەبی هورەیرەوە( ڕەزای خوای لێ بێ) پیاوێك ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا من ئەمەوێت سەفەر بكەم، سا ئامۆژگاریم بكە. ئەویش فەرمووی:« عَلَيْكَ بِتَقْوَى اللهِ. وَالتَّكْبِيرُ عَلَى كُلِّ شَرَفٍ » . واتە: تەقوای خوات هەبێت و لەسەر هەموو بەرزاییەك تەكبیر(الله أكبر) بكە. جا كاتێ پیاوەكە پشتی هەڵكردو ڕۆیشت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:« اللهُمَّ اطْوِلَهُ الأرضَ. وَهوِّنْ عَلَيهِ السَّفَرَ ». واتە: خوایە: زەوی بۆ بێنەوە یەك و گەشت و سەفەرەكەی لەسەر ئاسان بكە.(١٠٧)

# تەكبیر كردن لە بەرزاییو سەركەوتن و تەسبیح كردن لە دابەزیندا

قال جابر(ﷺ): « كُنَّا إِذَا صَعِدنَا كَبَّرنَا. وَإِذَا نَزَلنَا سَبَّحنَا ».(١٠٨)

واتە: جابر(ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرمووێت: ئێمە ئەگەر بە شوێنی بەرزدا سەربكەوتینایە -الله أكبر - مان دەكردو ئەگەر دابەزینایە -سُبحانَ الله - مان دەكرد.

---

(١٠٧) رواه الترمذي برقم(٣٤٤٥). وحسّنَهُ الألباني في صحيح الترمذي برقم(٢٧٤٠).
(١٠٨) البخاري مع الفتح ١٣٥/٦.

## پاڕانەوەی گەشتیار ئەگەر پارشێوی بەسەردا هات

« سَمَّــعَ سامِعٌ بِحَمْدِ اللهِ. وَحُسْنِ بَلائِهِ عَلَيْنا. رَبَّنا صاحِبْنا وَأفْضِلْ عَلَيْنا عائِذاً بِاللهِ مِنَ النّارِ ».[409]

واتە: (سمع سامعٌ) شایەتێك ئاگادار بوو شایەدیدا لەسەر ستایش کردنمان بۆ خوای گەورە لەبەر نیعمەتەکانی و چاك و تاقیکردنەوەمان. وە ماناي (سَمَّعَ سامِعٌ) : واتە: بیسەری ئەم ووتەیەم گەیاندنی بە غەیری خۆی و ئەویش وەکو ئەمەی ووت بۆ ئاگادار کردنەوە لەسەر ذیکرکردن لە پارشێوداو لەسەر پاڕانەوە تیایدا. وە پەروەردگار بمانپارێزەو فەزڵی خۆتمان بە سەردا بڕژە بە نیعمەتەکانت و هەموو خراپەیەکمان لێ دوور بخەرەوە.[410] پەنا ئەگرم بە خوای گەورە لە ئاگری دۆزەخ.

## نزاو پاڕانەوەی گەشتیار ئەگەر دابەزییە جێگایەکلە گەشتەکەیدا یان لە غەیری گەشت دا

بڵێ: « أعوذُ بِكَلِماتِ اللهِ التّامّاتِ مِن شَرِّ ما خَلَقَ ».[411]

---

(409) مسلم 4/2086.

(410) شرح النووي 17/39.

(411) ئەگەر ئەمە بڵێ هیچ شتێك زیانی پێناگەیەنێت تا لەو شوێنەی بار ئەکات/مسلم 4/ 2080.

واته: پەنا ئەگرم بە ووشە تەواوەكانی خوای گەورە لە خراپەی دروست كراوەكانی.

## نزاو ذیكری گەڕانەوە لە گەشت

لە ابن عمرەوە (ڕەزای خوایان لـێ بێـت): پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر لەغەزا یان لەحەج بگەڕایەتەوە لەسەر هەموو بەرزاییەك سێ جار (الله اكبر) ی دەكردو پاشان دەیفەرموو: «لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ. لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ. وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيءٍ قَدِيرٌ. آيِبونَ. تائِبونَ. عابِدونَ. [ساجِدونَ]. لِرَبِّنا حامِدونَ. صَدَقَ اللَّهُ وَعْدَهُ. وَنَصَرَ عَبْدَهُ. وَهَزَمَ الأَحزابَ وَحْدَهُ». (١١٢)

واتە: هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لە(الله) تاكی بێ هاوەڵە. موڵك و ستایش بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێكدا بەتوانایە. گەڕاینەوە لەبێئاگایی بەتەوبەكردن و پەرستش كردن و كڕنوش بردنەوە. سوپاس و ستایشی پەروەردگارمان دەكەین. خوای گەورە بەڵێنەكەی بەڕاست بەجێهێناو بەندەكەی خۆی سەرخست و بەتەنها خۆی هەموو كۆمەڵ و پارتەكانی شكاند.

---

(١١٢) البخاري رقم(١٧٩٧) ومسلم ٢/٩٨٠ و ١١٢/٩.

# له كاتی هاتنی شتێكی خۆش یان ناخۆشیدا

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر شتێكی خۆشی بەسەردا بهاتایە دەیفەرموو: « الحَمْدُ للهِ الَّذي بنِعْمَتِه تَتِمُّ الصَّالحاتُ ».

واتە: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی كە بە نیعمەتی ئەوەوە هەموو چاكەكان تەواو دەبێ.

وە ئەگەر شتێكی ناخۆشی بەسەردا بهاتایەوە دەیفەرموو: « الحَمْدُ للهِ على كُلِّ حالٍ ». واتە: سوپاس و ستایش بۆ خوایە لەسەر هەموو بارێك. (٤١٣)



(٤١٣) أخرجه ابن السني في عمل اليوم والليلة والحاكم وصَحَّحَهُ ١/ ٤٩٩ وصحَّحَهُ الألباني في صحيح الجامع ٤/٢٠١.

## بەشی هەشتەم:

# فەزڵی صەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەری خوا( ﷺ )

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إنَّ اللَّهَ وَمَلائِكَتَهُ يُصَلُّونَ على النَّبِيِّ ● يا أيُّها الَّذِينَ آمَنوا صَلُّوا عَلَيهِ وَسَلِّموا تَسليماً ﴾ (الاحزاب: ٥٦)

واتە: خوای گەورەو مەلائیکەتەکانی صەڵاوات دەدەن لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) ئەی ئەوانەی ئیمانداران ئێوەش صەڵاواتی لەسەر بدەن و سەلامی لێ بکەن بە سەلام کردن.[414]

١- وە دەفەرموێت(ﷺ): «البَخيلُ مَنْ ذُكِرتُ عِندَهُ فَلَم يُصَلِّ عَلَيَّ».[415]

واتە: بەخیل ئەو کەسەیە کە لەلایدا ناوم دێنن و صەڵاواتم لەسەر نادات.

٢- وە دەفەرموێت(ﷺ): «لا تَجعَلوا قَبري عيداً وَصَلُّوا عَلَيَّ فإنَّ صَلاتَكُم تَبلُغُني حَيثُ كُنتُم».[416]

---

(٤١٤) مختصر تفسير ابن كثير (٣/١١٠-١١٢)

تێبینی: ئیمامی ابن القیم لە کتێبی(جلاء الأفهام في الصلاة والسّلام على خير الأنام) باسی ئەوە دەکات کە صەڵاواتی خوای گەورە لەسەر پێغەمبەرەکەی(ﷺ) بریتییە لە وەصف و پیاهەڵدانی لەلای فریشتەکان دا. وە صەڵاواتی مەلائیکەتیش لەسەری بریتییە لە دوعاو پاڕانەوە. وەبەریەرچی ئەوانەی داوەتەوە ئاوایدا کە دەڵێن صەڵاواتی خوای گەورە بۆی بریتییە لەرەحمەت و بەزەیی، وە ئەم جیاوازی خستۆتە نێوان (صەڵاوات ورەحمەت)ەوە. کە هەر ئەمەش ووتەی ئیمامی بوخارییە کە لە ابو العالیەوە دەیهێنێ، بڕوانە مختصر التفسير ابن كثير(٣/١٠٠، ١٠٩).

(٤١٥) الترمذي ٥/٥٥١ وغيره وانظر صحيح الجامع ٣/٢٥ وصحيح الترمذي ٣/١٧٧.

(٤١٦) ابوداود ٢/٢١٨ واحمد ٢/٣٦٧ وصحّحَهُ الألباني في صحيح ابي داود ٢/٣٨٣.

واتە: دوای خۆم گۆڕەکەم مەکەن بە ئاهەنگ و جەژن و صەڵاواتم لەسەر بدەن. چونکە صەڵاواتەکانتانم پێدەگات لەهەر شوێنێك بن.

٣- پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: « مَنْ صَلّى عَلَيَّ صَلاةً صَلّى اللهُ عَلَيه بها عَشراً ». (٤١٧)

واتە: هەرکەسێك یەك صەڵاواتم لەسەر بدات خوای گەورە بەهۆیەوە(دە) صەڵاواتی لەسەر دەدات. (٤١٨)

٤- وە دەفەرموێت(ﷺ): « إنّ لله مَلآئكةً سيّاحينَ في الأرضِ يُبَلّغوني منْ أمّتي السّلام ». (٤١٩)

واتە: خوای گەورە چەند مەلائیکەتێکی گەڕۆکی هەیە لە زەویدا کە سڵاوی ئوممەتەکەمم پێدەگەیەنن کە لێم دەکەن.

٥- وە دەفەرموێت(ﷺ): « ما منْ أحَدٍ يُسَلّمُ عَلَيَّ إلاّ رَدَّ اللهُ عَلَيَّ روحِيَ حَتّى أرُدَّ عَلَيهِ السّلامُ ». (٤٢٠)

واتە: هیچ کەسێك نییە کە سڵاوم لێ بکات ئیلا خوای گەورە ڕۆحەکەم بۆ دەگێڕێتەوە هەتا وەڵامی سڵاوەکەی دەدەمەوە.

---

(٤١٧) أخرجه مسلم ٢٨٨/١.

(٤١٨) ئیمامی (الطیبی) دەفەرموێت: ( ئەگونجێ ئەو صەڵاواتەی خوای گەورە پاداشتەکەی وەك ئەو قسەیە بێت کە مەلائیکەتەکان دەیبیستن. بۆ ڕێزلێنانێکی بۆ ئەو کەسەی کە صەڵاواتەکەی داوەو تەکریمە بۆ ئەو، وەك خوای گەورە لە فەرموودەی قودسیدا دەفەرموێ: « وإنْ ذكرَني في مَلأٍ ذكرتُهُ في مَلأٍ خيرٍ منهم... ».

واتە: ئەگەر ئەگەر لە ناو کۆمەڵێکدا یادم بکات. منیش لە ناو کۆمەڵێکی لەوان چاکتردا باسی دەکەم). بڕوانە تحفة الأحوذي(٢/٦٢٠-٦٢١).

(٤١٩) النسائي. والحاكم ٤٢١/٢. وصحّحَهُ الألباني في صحيح النسائي ٢٧٤/١.

(٤٢٠) أبوداود برقم (٢٠٤١) وحسّنَهُ الألباني في صحيح ابي داود ٣٨٢/١.

## بەشی نۆیەم:

# بڵاوکردنەوەی سڵاو

١- پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: « لاتدخلُوا الجَنةَ حَتى لا تُؤمنُــوا. وَلا تُؤمنوا حَتى تحابّوا. أوَلا أدُلّكُم عَلى شيءٍ إذا فَعلتموهُ تَحابَبْتم؟ أفشُوا السّلامَ بَينكُم ». (٤٢١)

واتە: ناچنە بەهەشتەوە هەتا بڕواتان نەبێ‌و بڕواو ئیمانی تەواویتان نابێ هەتا یەکتریتان خۆش نەوێ. ئایا شتێکیان پێ بڵێم ئەگەر بیکەن لە ناوەکدا خۆشەویست دەبن لای یەك ؟ سڵاو زۆر بڵاو بکەنەوە لە ناو خۆتاندا.

٢- وە عەمماری کوڕی یاسر(ڕەزای خوا لێ بێت) دەفەرموێت: « ثَلاثٌ مَنْ جَمَعَهُنَّ فَقَد جَمعَ الإيمانَ: الإنصافُ مِن نَفسِكَ. وَبَــذلُ السّلامِ للعالَمِ. وَالإنفاقُ مِنَ الإقتارِ ». (٤٢٢)

واتە: سێ شت هەن هەرکەس لە خۆیدا کۆی بکاتەوە ئەوا ئیمانی کۆکردۆتەوە: ویژدان هەبوون لە حوکم دان دا بەرامبەر خۆت. وە سڵاوکردن لە خەڵکی. وە بەخشین لە کەم دەستیی‌و هەژاری.

٣- وە لە عبداللە ی کوڕی عومەروەوە(ڕەزای خوایان لەسەر بێت): کەوا پیاوێك پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە کام ئیسلام بوونە چاکە.فەرمووی: (( تُطعِــمُ الطّعـــامَ . وَتَقــرأُ الـــسّلامَ عَلَـــى مَـــنْ

---

(٤٢١) مسلم ٧٤/١ وغيره.

(٤٢٢) البخاري مع الفتح ٨٢/١ عن عمّار (رضي الله عنه) موقوفاً مُعلقاً.

عَرَفْتَ وَمَن لَمْ تَعرِف »[٤٢٣]

واته: خواردن ببهخشهو سلاو بكه لهو كهسهى كه دهیناسىو ئهوهش كه نایناسى.

## چۆن وهڵامى بێبڕوایهك دهدهیتهوه ئهگهر سڵاوى كرد

« إذا سَلّمَ عَلَيكُم أهلُ الكِتابِ فَقولُوا: وَعَلَيكُم ».[٤٢٤]

واته: ئهگهر خاوهن كتێبهكان(گاورو جولهكه)سلاویان لێكردن بڵێن: له ئێوه بێ.

تێبینی(١):سلاو كردن دروست نییه له كافرو بێبڕواو دووڕووهكان، مهگهر ترسى زهرهرێكى دین و دونیا بكهیت له ئهنجامى ئهو سلاونهكردنهوه لێى[٤٢٦].وهك ئیمامى ئهوهوهىو ابن العربي دهفهرموون .[٤٢٥]

وابن العربي زیاد لهوهش دهفهرموێت: وه دهبێ له وتنى (السّلامُ عَلَيكم)كهش مهبهستت وابێ كهوا خواى گهوره ئاگاداره بهسهرتانهوه، چونكه (السّلام)ناوێكه له ناوهكانى خواى گهوره.

تێبینی(٢):سلاوكردن له مهجلیسێكى تێكهڵ له كافرو موسڵمان دروسته به مهرجێ مهبهستت موسڵمانهكانى بێت. [٤٢٦]

---

(٤٢٣)البخاري مع الفتح ١/٥٥ ومسلم ١/٦٥.

(٤٢٤)البخاري مع الفتح ١١/٤٢ ومسلم ٤/١٧٠٥. له ڕیوایهتێكى تردا دهفهرموێ: « چونكه ئهو كاتهدا پێتان دهڵێن ( السّامُ عَلَيكُم)واته: مردن بۆ ئێوه بێت ». البخاري ١١/٤٢ ومسلم ٤/١٧٠٦

(٤٢٥)فتح الباري ١١/٤٠.

(٤٢٦)ئیمامى بوخارى ڕیوایهتى كردووه. فتح الباري ١١/٣٨.

**بەشی دەیەم:**

# هەندێ کاتی جیاوازی تر

## پاڕانەوە بۆ ئەو کەسەی

## کە جوێنت پێداوەو ئەزیەتت داوە

لە ئەبو هورەیرەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) کەوا بیستویەتی لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە فەرموویەتی: « اللَّهُمَّ فَأَيُّمَا مُؤْمِنٍ سَبَبْتُهُ فَاجْعَلْ ذَلِكَ لَهُ قُرْبَةً إِلَيْكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ».(٤٢٧)

واتە: خوایە جوێنم بە هەر ئیمانداریَك داوەو ئەزیەتم داوە ئەوا بۆی بکەرە نزیك بوونەوەیەك لە خۆت لە ڕۆژی دواییدا.

## لە کاتی خوێندنی کەڵەشێرو زەڕەی گوێدرێژدا

« ئەگەر گوێتان لە دەنگی کەڵەشێر بوو داوای فەزڵی خوای گەورە بکەن « اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ » چونکە مەلائیکەتی بینیوە. وە ئەگەر گوێتان لە دەنگی زەڕینی گوێ درێژ بوو پەنا بگرن بەخوای گەورە لە شەیطان « أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ » چونکە شەیطانی بینیوە ».(٤٢٨)

---

(٤٢٧) البخاري مع الفتح ١١/١٧١ ومسلم ٤/٢٠٠٧ وە لەلایەکی: « فاجعلها لَهَا زَكَاةً وَرَحْمَةً ». واتە: بۆی بکەرە پاك بوونەوەو بەزەیی بۆی.

(٤٢٨) البخاري مع الفتح ٦/٣٥٠ ومسلم ٤/٢٠٩٢.

# ئەگەر گوێت لە دەنگی سەگ بوو بە شەو

« إذا سَمِعْتُم نُباحَ الكلابِ وَنَهيقَ الحَميرِ باللَّيلِ فَتَعَوَّذوا بِاللهِ مِنهُنَّ فَإنَّهُنَّ يَرَينَ ما لا تَرونَ ». (٤٢٩)

**واتە: ئەگەر گوێتان لە دەنگی وەڕینی سەگ و زەڕەی گوێ درێژ بوو بە شەو ئەوا پەنا بگرن بەخوای گەورە لێیان چونکە ئەوان شتێك دەبینن لەو کاتەدا کە ئێوە نایبینن.**

# موسلمان چی بڵێ لە کاتی مەدح کردنی موسڵمانێك دا

**پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ئەگەر یەکێ لە ئێوە هەر دەبوو بە چاکە باسی هاوەڵەکەی بکات بابڵێ:** « أحسبُ فُلاناً وَاللهُ حَسيبُهُ ولا أُزَكّي على اللهِ احداً، احسِبُهُ – إن كانَ يَعلَمُ ذلكَ – كَذا وَكَذا » (٤٣٠)

**واتە: وا گومان دەبەم و وابزانم کە فڵانە کەس( کەخوای گەورەش باشتر دەیناسێ و دەزانێ و کەس بەسەر خوای گەورەدا پاك ڕاناگرم). وای دەناسم _ ئەگەر ئەوسیفەتەی تێدا شك برد _ ئاواو ئاوایە.**

---

(٤٢٩) ابوداود ٤/٢٣٧ واحمد ٢٠٦/٣ وصَحَّحَهُ الالباني في صحيح ابي داود ٩٦١/٢.

(٤٣٠) رواه مسلم ٢٢٩٦/٤

تێبینی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی کردووە بە خۆڵ کردن بەدەم وچاوی مەدح کەراندا/ مسلم ١٢٧/١٨.

## موسلمان چی دەڵێ ئەگەر بە باش باس کرا

« اللهُمَّ لا تُؤاخِذني بِما يَقولونَ. وَاغْفِر لي ما لا يَعلَمونَ [ وَاجعَلني خَيراً مِمّا يَظنّونَ] ».(٤٣١)

واتە: خوایە ئەوەی ئەوان دەیڵێن بەهۆیەوە لەسەرم مەگرە و لەو گوناهانەم خۆش ببە کە ئەوان نایزانن و لەو مەدح و وەسفە چاکترم بکە کە ئەوان گومانم پێ دەبەن.

## چۆن حاجی تەلبیە دەکات لە حەج یان لە عومرەدا

١- « لَبَّيكَ اللهُمَّ لَبَّيكَ. لَبَّيكَ لا شَريكَ لَكَ لَبَّيكَ. إنَّ الحَمْدَ وَالنِّعمَةَ. لَكَ وَالْمُلكَ. لا شَريكَ لَكَ ».(٤٣٢)

واتە: خوایە وەڵامی دوای وەڵام دەدەمەوە لە گوێ ڕایەڵیت دا. هیچ هاوبەشێکت نییە. ستایش و نیعمەت و موڵک بۆ تۆیە. هیچ هاوبەشێکت نییە.

٢- وە عومەر(ڕەزای خوای لێ بێت) دەیفەرموو: « لَبَّيكَ اللهُمَّ لَبَّيكَ. لَبَّيكَ وَسَعدَيكَ. وَالخَيرُ في يَدَيكَ. لَبَّيكَ وَالرَّغْباءُ إلَيكَ وَالعَمَلُ ».(٤٣٣)

---

(٤٣١) البخاري في الأدب المفرد برقم (٧٦١). وصَحَّحَ إسناده الألباني في صحيح الأدب المفرد برقم (٥٨٥). وبين المعكوفين زيادة للبيهقي في شعب الإيمان ٢٢٨/٤ من طريق آخر.

(٤٣٢) البخاري رقم (١٥٤٩) و(٥٩١٥)، و مسلم رقم (١١٨٤) واللفظ له. انظر تخريج الحديث في جامع الأصول ٩١/٣.

(٤٣٣) رواه مسلم ٨٩/٨.

واته: خوایه وەڵامی دوای وەڵام و گوێڕایەڵیم هەیە بۆ فەرمانەکانت. خێروچاکە لە دەستی تۆدایە. وەڵامی فەرمان و لومێدو هیواو کردار ئەنجام دان بۆ تۆیە.

٣- وە لە ئەبی هورەیرەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێ: لە تەلبیەکردنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوەبوو دەیفەرموو:
(( لَبَّيكَ إلَهَ الحَقِّ ))[٤٣٤]

واتە: فەرمانبەرداری تۆم ئەی پەرستراوی بە هەق.

تێبینی: لە عەمرەکردن دا کاتێ دەچێتە حەرەمەوە تەلبیە کردن دەوەستێنێ‌و کۆتایی پێ دێنێت.[٤٣٥] بەڵام لە حەج کردندا لە دوای ڕەجم کردنی(الجَمرَةُ العقبة)ەوە کۆتایی پێ دێت.[٤٣٦]

# تەکبیر کردن کاتێ دەگاتە

# گۆشە ڕەشەکە( الرُكن الأسوَد )

(( پێغەمبەری خوا(ﷺ)بەسەر حوشترەکەیەوە بە دەوری کەعبەدا سووڕایەوەو هەرکاتێ دەگەیشتە گۆشەکە بەرەو ڕووی ئیشارەتی‌دەکرد بەشتێك کەپێی بوو وە(الله أکبر)ی دەکرد ))[٤٣٧].

---

(٤٣٤) رواه ابن خزيمة في صحيحه برقم(٢٦٢٤) وصَحَّحَهُ الألباني في السلسلة الصحيحة برقم(٢١٤٦).

(٤٣٥) رواه المالك في الموطأ رقم(١١٢٢).

(٤٣٦) رواه البخاري(١٦٨٥).

(٤٣٧) البخاري مع الفتح ٣/٤٧٦.( وە مەبەست بە(شت) لە فەرموودەکەدا بریتییە لە ( گۆچان ) بڕوانە البخاري مع الفتح ٣/٤٧٢.

## پاڕانەوە لە نێوان گۆشەکەی لای یەمەن
## (الرُكنُ اليَماني)و بەردە ڕەشەکە(الحَجَر الأسودُ)

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە نێوان گۆشەی ڕووی یەمەن و بەردە ڕەشەکەدا دەیفەرموو:﴿ رَبَّنا آتِنا فِي الدُّنيا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنا عَذابَ النّارِ ﴾.[٤٣٨]

واتە: پەروەردگار لە دونیادا چاکەو لە دوا ڕۆژدا چاکەمان پێ ببەخشەو لە سزای ئاگر بمانپارێزە.

## پاڕانەوەی وەستان لەسەر( صەفا ) و ( مەروە )

جابر(ڕەزای خوای لێ بێت) لە باسی شێوازی حەجی پێغەمبەردا(ﷺ) دەفەرموێت: « کاتێك نزیك بوویەوە لە صەفا فەرمووی:﴿ إنَّ الصَّفا وَالمَروَةَ مِن شَعائِرِاللهِ ﴾ أبدَأ بِما بَدَأ اللهُ بِهِ ».

واتە: ( صەفاو مەروە لە دروشمەکانی خوای گەورەیە کە دایناوە، بەوەیان دەست پێ دەکەم کە خوای گەورە دەستی پێکردووە)، بۆیە بە صەفا دەستی پێکردوو سەرکەوت

(٤٣٨) أبوداود ٢/١٧٩ وأحمد ٣/٤١١ والبغوي في شرح السنة ٧/١٢٨ وحسَّنَهُ الألباني في صحيح أبي داود ١/٣٥٤. والآية من سورة البقرة/ ٢٠١ وانظر مختصر تفسير ابن كثير ١/٢٠٢.

بەسەریدا هەتا چووە سەرەوەو کەعبەی بینیءو ڕووی کردە ڕووگە(قیبلە)و خوای گەورەی بە تاك ڕاگرت و بەگەورەی داناو فەرمووی: « لآ إلهَ إلاّ اللّهُ وَحدَهُ لا شَريكَ لَه، لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمـدُ وَهوَ على كلِّ شيءٍ قَدير. لآ إلهَ إلاّ اللّهُ وَحدَهُ . انجزَ وَعْدَهُ. وَنَـصرَ عَبدَهُ. وَهَزَمَ الأحزابَ وَحْدَهُ ».

واتە: هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە (اللّه)كی بێ هاوەڵەو موڵك و ستایش بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێكدا بە توانایە. هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لە (اللّه)تاكە. بەڵێنی خۆی هێنایەدیءو بەندەكەی خۆی سەرخست و بە تەنیا هەموو كۆمەڵو پارتەكانی شكان. پاشان لەم نێوانەدا پاڕایەوە. وە سێ‌جار وەك ئەمەی فەرموو) فەرمووبەكە... وە تیایدا هاتووە كە (چی لەسەر صەفا كرد ئاواشی لەسەر مەروە كرد). (٤٣٩)

# لە كاتی ڕۆیشتندا بەرەو عەرەفە

لە ابن عمرەوە(ڕەزای خوایان لێ بێت) دەفەرموێت: بەیانییەك لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ)لە میناوە ڕۆیشتین و كەوتینە ڕێ بەرەوعەرەفات، تیاماندابوو تەلبیەی دەكردو هەشمانبوو تەكبیری دەكرد (٤٤٠)

---

(٤٣٩)مسلم ٨٨٨/٢.

(٤٤٠)رواه البخاري ٩٥/١٦ ومسلم ٢٩/٩.

# نزاو پاڕانەوەی ڕۆژی عەرەفە

( چاکترین پاڕانەوە، پاڕانەوەی ڕۆژی عەرەفەیە.وە چاکترین نزایەك کە من و پێغەمبەرانی پێش من فەرموویانە ئەمەیە: « لآ إلهَ إلاّ اللهُ وَحدَهُ لا شريكَ لَه، لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمْدُ وَهوَ على كُلّ شيءٍ قَدير ».[441]

# نزاو ذیکری لای ( المَشعَرِ الحَرام ) [442]

جابر(ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێت: « پێغەمبەری خوا(ﷺ)سواری(القَصْواء) بوو- کە حوشترەکەی بوو- هەتا گەیشتە(المَشعر الحَرام)و ڕووی کردە ڕووگە(قیبلە)وە پاڕایەوەو « اللهُ أكبر وَلآ إلهَ إلاّ اللهُ وَحدَهُ لا شَريكَ لَه...» ی کردو بەردەوام ئاوا بە پێوە مایەوە هەتا بە تەواوی دنیا ڕووناك بوویەوەو پێش ئەوەی خۆر هەڵبێ ڕۆیشت و دەرچوو ».[443]

---

(441)الترمذي وحَسَّنَهُ الالباني في صحيح الترمذي ٢/١٨٤ وفي الاحاديث الصحيحة ٦/٤ وە سوننەت وایە جگە لە ڕۆژانی ئەم ذیکرە تەلبیە بکات و بیاڵێتەوە.

(442)دەربارەی (المشعر الحرام)ووتراوە بریتیە لە شاخی (قُزَح)کە شاخێکی بچووکە لە (مزدلفة)دا. وە لەعلی تەفسیر سەیرو فەرموودەناسان فەرموویانە: (المشعر الحرام)هەموو (مزدلفة)دەگرێتەوە/ انظر شرح النووي على مسلم ٨/٨٩.

(443)مسلم ٢/٨٩١.

## تەکبیر کردن لە کاتی

## ڕەجم کردنی (الجمار)ەکاندا لەگەڵ هەموو زیخێکدا

« پێغەمبەری خوا(ﷺ) جەمرکات زیخێکی دەهاوێشت لە لای (الجمار)ەکانەوە تەکبیری (الله أکبر)ی دەکرد، پاشان دەچووە پێشەوەو دەوەستاو ڕوووەو قیبلە دەپاڕایەوە بە دەستی بەرزکردنەوە لەدوای جەمرەی یەکەم و دووەم. بەڵام لەلای (جَمرَةَ العَقَبَة)دا زیخەکەی دەهاوێشت و تەکبیری دەکرد لەگەڵ هەموو زیخێکداو دەڕۆیشت و لەلایدا نەدەوەستا ». [444]

## لە کاتی سەرسووڕمان و بینینی شتی سەیردا

١- « سُبحانَ الله » [445] واتە: پاك و بێگەردی بۆخوایە.

٢- « الله أكبر » [446] واتە: خوا گەورەیە.

---

(٤٤٤) البخاري مع الفتح ٣/٥٨٣ و ٣/٥٨٤ وە بڕوانە لەلفزەکەی لەوێندا البخاري مع الفتح ٣/٥٨١ هەروەها(مسلم)یش ڕیوایەتی کردووە.

(٤٤٥) البخاري مع الفتح ١/٢١٠ و ٣٩٠ و ١٤١ ومسلم ٤/١٨٥٧.

(٤٤٦) البخاري مع الفتح ٨/٤٤١ وانظر صحيح الترمذي ٤/١٠٣ و ٢/٢٣٥ ومسند احمد ٥/٢١٨

## چی ئەکات ئەگەر هەواڵێکی خۆشی بۆ هێنرا

( كانَ النَّبيُّ (ﷺ) إذا أتاهُ أمرٌ يَسُرُّهُ أو يُسَرُّ بهِ خَرَّ ساجداً شُكراً للهِ تبارَكَ وتعالى ). [447]

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر هەواڵێکیان بۆ بهێنایە دڵی خۆش بکردایە یان پێی دڵخۆش بووایە کڕنووشی دەبرد لە سوپاسی خوای گەورەدا.

## چی دەڵێت ئەگەر لە چاوی خۆی ئەترسا بدا لە شتێك و ببێتە هۆی زیان پێگەیاندنی

« ﴿ ماشاءَ اللهُ لا قُوَّةَ إلاَّ باللهِ ﴾ اللهُمَّ بارِكْ عَلَيهِ ». [448]

واتە: ئەوەی خوای گەورە ویستی بێت دەبێ و هێز و توانایەك نییە مەگەر بەخواوە. خوایە لەو بەرەكەتی تێبخە.

---

(447) رواه أهل السنن إلاّ النسائي. انظر صحيح ابن ماجه 1/233 وإرواء الغليل 2/226.

(448) بۆ بەشی یەکەمی بڕوانە سورەتی (الكهف) ئایەتی (39). وە بۆ بەشی دووەمیش پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: « ئەگەر یەکێك لە ئێوە شتێکی لەبراکەی یان لە خۆی یان لە ماڵ و سامانیدا بینی کە سەرسامی کردبوو وە بەلایەوە سەیربوو (با داوای بۆ بکات بە بەرەکەت). چونکە چاو ڕاستە و ڕەوایە » مسند أحمد 4/447 وابن ماجه. ومالك. وصَحَّحَهُ الألباني في صحيح الجامع 1/212 وانظر تحقيق زاد المعاد للأرناؤوط 4/170.

## ئەگەر لە چاوی یەکێك ترسایت

« سورەتی﴿ الفَلَق ﴾ و﴿ النّاس ﴾ بخوێنە». [449]

## ئەگەر کەسێك چاو لێی دا

( با چاو پیسەکە دەست نوێژ بگرێت و پاشان ئاوی دەست نوێژەکە بکەن بەسەر ئەو کەسەدا کە چاو لێی داوەو خۆی پێ بشوات ). [450]

## ئادابی ماڵ و منداڵ پاراستن

« إذا كانَ جُنحُ اللّيلِ ـ أو أمسيتُم ـ فكُفُّوا صِبيانَكُم. فإنَّ الشَّياطينَ تَنتَشِرُ حينَئِذٍ. فإذا ذَهَبَ ساعةٌ مِنَ اللّيلِ فَخَلُّوهُم. وَأغلِقُوا الأبوابَ وَاذكُرُوا اسمَ اللهِ. فإنَّ الشَّيطانَ لا يفتَحُ باباً مُغلَقاً. وَأوكُوا قِرَبَكُم وَاذكُرُوا اسمَ اللهِ. وَخَمِّروا آنِيَتَكُم وَاذكُرُوا اسمَ اللهِ. وَلَو أن تَعرُضُوا عَلَيها شَيئاً. وأطفِئُوا مَصابيحَكُم » [451]

واتە: ئەگەر شەو داهات، یان ئێوارەتان بەسەرداهات منداڵەکانتان بگرنەوە لەیاری کردن و کۆڵان. چونکە شەیطانەکان

(449) رواه الترمذي والنسائي وابن ماجه عن ابي سعيد الخدري ﷺ . حديث حسن/انظر الاذكار للنووي ص ٢٨٣.

(450) ابي داود ٤/ ٩ بإسناد صحيح على شرط البخاري ومسلم عن عائشة ( رضي الله عنها ) وزاد المعاد ٤/١٦٣. انظر الاذكار للنووي ص ٢٨٣.

(451) البخاري مع الفتح ١٠/٨٨ ومسلم ٣/١٥٩٥.

لەوکاتەدا بڵاوەبنەوە. وە کە کاتێک لەشەو ڕۆیشت وازیان لێبهێنن، وە دەرگاکان دابخەن و ناوی خوای گەورە بهێنن چونکە شەیطان دەرگایەکی داخراو ناکاتەوە. وە دەمی مەشکەو کوندەکانتان بەپەت ببەستن و ناوی خوا بهێنن. وەسەری قاپەکانتان بنێنەوەو دایپۆشن و ناوی خوا بهێنن. ئەگەر چی شتێکی بچوکیشی بخەنە سەر. وە چراکانتان بکوژێننەوە.

## سوننەتەکانی فیطرەت

عنْ عائِشةَ(رضي الله عنها) قالَت: قالَ رسول اللهِ(ﷺ): (( عَشرٌ مِنَ الفِطْرَةِ: قَصُّ الشارِب، وَإعفاءُ اللِّحيَةِ، وَالسِّواكِ، وَاستنشاقُ الماءِ، وَقَصُّ الأظفارِ، وَغَسلُ البَراجِمِ، وَنَتفُ الإبطِ، وَحَلقُ العانةِ، وانتِقاصُ الماءِ )) قال الراوي: ونَسيتُ العاشِرَةَ إلاّ أن تكونَ(المَضمَضَةُ). قال وَكيع - وهو أحَدُ رواتِهِ-: إنتِقاصُ الماءِ: يعني الإستِنجاءَ )).[152]

واتە: (دە) شت لە فیترەتەوەیە: سمێڵ کورت کردنەوە و ڕیش هێشتنەوە و سیواک کردن و ئاو لە لووت وەردان و نینۆک کردن و

(152) رواه مسلم(٦٠٢) و ابوداود(٥٣)/ وە لە فەرموودەی تردا بەم جۆرەش هاتووە: عن ابي هريرة(ﷺ) عن رسول الله(ﷺ) قال: (( الفِطرةُ خَمسٌ: الإختِتانُ. والإستِحدادُ. وَقَصُّ الشارِبِ وَتَقليمُ الأظفارِ. وَنَتفُ الإبطِ )). صحيح. ابن ماجه (٢٩٢)ق (آداب الزفاف ١١٧ وإرواء الغليل ٧٣) انظر صحيح سنن النسائي باختصار السند للالباني ص٥.. واتە: فیترەت پێنجە: یان پێنج شت لە فیترەتەوەیە: خەتەنە کردن و تاشینی مووی شەرمگا و سمێڵ کورت کردنەوە و نینۆک کردن و تووکی بن باڵ هەڵکێشان.

شۆڕدنی(البراجم): ( كه كۆی(برجمة)یه واته: ئەو شوێنانەی كه چلكی تێدا كۆدەبێتەوە وەك خەتی سەر پەنجەكان). وە هەڵكێشان و لابردنی مووی بن باڵ و تاشینی مووی داوێن و شەرمگاو (انتقاصُ الماءِ).

ڕاوی دەفەرموێت: (دە)یەمم لەبیر چۆتەوەو پێم وابێت : ئاو لەدەم وەردانە. وە(وەكیع)- كە یەكێكە لە ڕاوییەكانی- دەفەرموێت: (انتقاصُ الماءِ) واتە: ئاودەست گرتن و خۆپاكردنەوە بە ئاو.

عَنْ أنس بن مالِك قالَ: « وُقِّتَ لَنا رسولُ الله (ﷺ) في قَصِّ الشَّارب وَتَقليمِ الأظفار. وَحَلْقِ العانة. وَنَتْفُ الإبطِ أن لا نَتْرُكَ أكثر مِنْ أربعينَ يوماً » وقال مَرَّةً أخرى أربعينَ لَيلَةً.(٤٥٣)

واته: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆی دانــاوین كه كورت كردنەوەی سمێڵ و نینۆك كردن و لابردن و تاشینی مووی شەرمگاو تووكی بن باڵ هەڵكێشان له چل ڕۆژ یان چل شەو زیاتر وازی لێ نەهێنین.

---

(٤٥٣)صحيح. ابن ماجه (٢٩٥) م. انظر صحيح سنن النسائي باختصار السند للألباني ص٥.

## سمێڵ کورت کردنەوەو ڕیش بەردانەوە

عن ابن عُمَر عَنِ النَّبيِّ(ﷺ)قال: « أحفُوا الشَّوارِبَ وأعفُوا اللّحىَ»[454]

واتە: سمێڵ کورت بکەنەوە و ڕیش بهێڵنەوە.

## کورتی پۆشاك و نەخشاندنی بە دوای خۆیدا

« ما تَحتَ الكَعبينِ مِنَ الإزارِ فَفي النَّارِ ». [455]

واتە: ئەوەی کە ئەکەوێتە ژێر دوو قولە پێکەوە لە پۆشاك لە ئاگردایە.

تێبینییەکەی ئەکرانە:

ئیمامی النووی(رەحمەتی خوای لێ بێت) ئەفەرموێت: ( پۆشاك درێژی لە کراس و قەمیص و عەمامەو پۆشاك دایە. وە دروست نییە ئەگەر بۆ خۆبەزل زانین بوو لێز بوو بهێلرێتەوە تا خوار قولەپێکان. خۆ ئەگەر بۆ لیز نەبوو مەکروهە. وە موستەحەبە تا ناوەڕاستی قاچ بێت. وە دروستیشەو مەکروه نییە کە بگاتە دوو قولەپێکە . بەڵام لەوە دابەزێ یاساغ کراوە لە شەرع دا).

---

(454) صحيح. الترمذي (2925) و (2926): في ( رياض الصالحين 1213 وصحيح الجامع 207 ) انظر صحيح سنن النسائي باختصار السند للالباني ص(6).

(455) رواه الامام احمد 6/254 وهو في صحيح الجامع (5571). و البخاري هێناویەتی(10/218) بە لەفزی« ما اسفَلَ منَ الكَعبَينِ منَ الإزارِ ففي النارِ » عن ابي هريرة(ﷺ).

وەهەروەها ئیبن حەجەر(ڕەحمەتی خوای لێ بێت)لە(فَتحُ الباری )دا دەفەرموێت: ( وە قاضي عیاض ئیجماعی هێناوە لەسەر ئەوەی ئەم مەنعە دەربارەی بە پیاوانەوە تایبەتە ناگرێتەوە(واتە درێژکردنەوەی پۆشاك تا خوار قولەپێکان). پاشان دەفەرموێ: ( بەهەرحاڵ پیاوان دوو حاڵەتیان بۆ هەیە: یەکێکیانە باشەو ئیستحبابەو ئەویش ئەوەیە کە پۆشاکەکەی کورت بکاتەوە تا ناوەڕاستی ئێسقانی قاچی. وە حاڵەتێکی تریش کە دروستەو جائیزە تا دوو قولەپێکە) [٤٥٦]

وە جیاوازی نییە لەمەدا لە نێوان پۆشاکی(عەرەبی یان کوردی یان فارسی یان تورکی یان... هتد) .

.وە ئەگەر ئەم کارەی بۆ فیزو خۆبەزل زانی دەکرد ئەوا سزاکەی سەخت تر دەبێت و ئەم جۆرە کەسانە لە ڕۆژی دواییدا لەو کەسانەن کە خوای گەورە قسەیان لەگەڵ ناکات و تەماشایان ناکات و لە گوناه پاکیان ناکاتەوەو سزایەکی ئازاراویان بۆ هەیە. [٤٥٧]

---

(٤٥٦)بڕوانە کتێبی( قطوف من الشمائل المحمدية)ی محمد جمیل زینو لاپەڕە(٩٩).

(٤٥٧)رواه مسلم(١٠٦) عن ابي ذر (ﷺ).

## بەشی پانزەهەم:

# داوای لێخۆش بوون کردن و گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە (الإستغفار والتوبة)

١- پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: «وَاللهِ إِنِّي لأَسْتَغْفِرُ اللهَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ فِي الْيَوْمِ أَكْثَرَ مِنْ سَبْعِينَ مَرَّةً».(١٥٨)

واتە: سوێند بەخوا من لە ڕۆژێکدا زیاد لە حەفتا جار داوای لێخۆش بوون دەکەم لە خوای گەورەو دەگەڕێمەوە بۆلای.

٢- وە چاک وایە لە ڕۆژێک دا(سەد) جار بوترێ: «أَسْتَغْفِرُ اللهَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ».(١٥٩)

واتە: داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆلای.

٣- وە دەفەرموێت (ﷺ) «يا أَيُّها النَّاسُ تُوبوا إِلَى اللهِ. فَإِنِّي أَتُوبُ فِي الْيَوْمِ إِلَيْهِ مِائَةَ مَرَّةٍ».(١٦٠)

واتە: ئەی خەڵکی بگەڕێنەوە بۆ لای خوا. بە ڕاستی من لە ڕۆژێک دا(سەد)جار دەگەڕێمەوە بۆلای.

---

(١٥٨)البخاري مع الفتح ١١/١٠١.

(١٥٩)البخاري مع الفتح ١١/١٠١ ومسلم ٤/٢٠٧٥.

(١٦٠)مسلم ٤/٢٠٧٦.

٤- وە دەفەرموێت (ﷺ): «مَنْ قالَ (أستغفرُ اللهَ العَظِيمَ الَّذي لا إلهَ إلاّهوَ الحيُّ القيومَ وأتوبُ إليه) غفَرَ اللهُ لَهُ وإنْ كانَ فرَّ منَ الزَّحفِ»[٤٦١]

واتە: هەرکەسێك بڵێ: داوای لێخۆشبوون دەکەم لەو خودا مەزنەی کە هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لەو، وە زیندووی هەڵسووڕێنەری بوونەوەرەو دەگەڕێمەوە بۆ لای. ئەوا خوای گەورە لێی خۆش دەبێ ئەگەر چی لە کاتی بەرەنگاربوونەوەی دوژمن پشتی هەڵکردبێ و ڕای کردبێ.

٥- وە دەفەرموێت (ﷺ): «طُوبَى لِمَنْ وُجِدَ فِي صحيفتهِ استغفاراً كثيراً»[٤٦٢]

واتە: خۆش بەختی (یان طوبا کە دارێکە لە بەهەشت دا) بۆ کەسێك کە لە نامەی کردەوەکانیدا داوای لێخۆش بوون کردنی لە خوای گەورە زۆر تێدا بێت.

٦- وە دەفەرموێت (ﷺ): «أقرَبُ ما يكونُ الرّبُّ منَ العبدِ في جَوفِ اللّيلِ الآخِرِ. فإنِ استَطَعْتَ أن تكونَ مِنَ

(٤٦١) اخرجه ابوداود ٢/٨٥ والترمذي ٥/٥٦٩ والحاكم وصححه ووافقه الذهبي ١/٥١١ وصححه الالباني. انظر صحيح الترمذي ٣/١٨٢ وجامع الاصول لاحاديث الرسول (ﷺ) ٤/٣٨٩، ٣٩٠ بتحقيق الارناؤوط

(٤٦٢) رواه ابن ماجه (٣٨١٨) والنسائي في عمل اليوم والليلة ٤٥٥ وصححه الالباني في صحيح الجامع ٣٩٣٠.

يَذكُرُ اللهَ في تلكَ السّاعة فكُنْ ». (٤٦٣)

واته: نزيكترين كاتێك كه پەروەردگار له بەندەكەیەوە نزیك بێت له ناوەراستی كۆتایی شەودایه ئەگەر توانیت لەو كەسانەبێت كە یادی خوای گەورە دەكەن لەو كاتەدا ئەوا ببە.

٧- وە دەفەرموێت(ﷺ) « أقربُ ما يكونُ العَبْدُ من رَبِّـهِ وَهــوَ ساجدٌ فأكثروا الدُّعاءَ ». (٤٦٤)

واته: نزیكترین كات كە بەندە لە پەروەردگاریەوە نزیكە لە كاتی كڕنووش بردنیدایە. دەسا لەو كاتەدا زۆر بپاڕێنەوە تیایدا

٨- وە دەفەرموێت(ﷺ) « إنَّهُ لَيُغانُ عَلى قَلبــي وإنّي لأستغفِرُ اللهَ في اليومِ مائةَ مَرَّةٍ ». (٤٦٥)

واته: تارمایی دێت بەسەر دڵم داو پێیم تەچێ.وە من لە ڕۆژێك دا (سەد)جار داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە دەكەم

---

(٤٦٣) اخرجه الترمذي والنسائي ٢٧٩/١ والحاكم و انظر صحيح الترمذي ١٨٢٣ وجامع الاصول بتحقيق الارناؤوط ١٤٤/٤.

(٤٦٤) مسلم ٣٥٠/١.

(٤٦٥) اخرجه مسلم ٢٠٧٥/٤. ابن الاثير دەفەرموێت: (ليُغانُ عَلى قلبــي) واته: دایدەگرێتەوەو دایدەپۆشێ. وە مەبەست پێی (بێ ئاگایی)یە. چونكە پێغەمبەر ﷺ بەردەوام لە زیادە نزیكبوونەوە و نزیك بوونەوەو بەردەوامێتی چاودێری خۆكردن دا بووە. بەڵام كاتێ ئاگای لێ نەمایە لە هەندێ كاتەكانیدا یان بیری بچوایە ئەوا بە گوناه حسابی دەكرد لەسەر خۆی و یەكسەر داوای لێخۆشبوونی دەكرد لەخوای گەورە! بڕوانە جامع الأصول ٣٨٦/٤.

**بەشی دوازدەهەم:**

# فەزلی (تەسبیح و تەحمیدو تەهلیل و تەکبیر) کردن[١٦٦]

١- عَن أبي هُرَيرَةَ (ﷺ) أن رسول الله (ﷺ) قَالَ: « مَنْ قَالَ: ( لا إلهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَريكَ لَهُ. لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمْدُ وَهُوَ عَلى كُلِّ شَيءٍ قَدِير) في يومٍ مائةَ مَرَّةٍ كانَتْ لَهُ عَدلُ عَشرِ رقَابٍ وَكُتِبَتْ لَـهُ مائـةُ حَسَنَةٍ. وَمُحِيَت عَنْهُ مائةَ سَيئَةٍ وَكَانَت لَهُ حِرزاً منَ الشَّيطانِ يومَـهُ ذلكَ حَتّى يُمسِيَ. وَلَمْ يَأتِ أحَدٌ افضَلَ ممّا جاءَ بِهِ إلاّ أحَدٌ عَمِـلَ أكثَرَ مِن ذلكَ »[١٦٧]

**واتە: هەر کەسێ لەڕۆژێکدا سەدجار بڵێ: هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لە(الله) تاکی بێهاوەڵەو موڵك و ستایش بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێك دا بە توانایە، ئەوا بە ئەندازەی ڕزگارکردنی دە کۆیلە چاکەی دەست دەکەوێت و(سەد) چاکەی بۆ دەنوسرێت و(سەد) گوناهی لێ دەسڕێتەوەو ئەو ڕۆژە لە شەیطان پارێزراو دەبێ هەتا ئێوارەی لێ دەبێتەوەو کەس بە پاداشتی لەم چاکترەوە نایەت مەگەر کەسێك لەم زیاتر بکات.**

---

(١٦٦) تەسبیح واتە (سُبحانَ اللهِ) کردن و تەحمید واتە (الحَمدُللهِ) و تەهلیل واتە وتنی ( لا إلهَ إلاَّ الله ) و تەکبیر واتە ( اللهُ أكبَرُ ) کردن.

(١٦٧) البخاري ٤/٩٥ ومسلم ٤/٢٠٧١.

٢- وە دەفەرموێت(ﷺ) :« مَنْ قالَ: ( سُبْحانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ ) في يومٍ مائةَ مَرّةٍ حُطّتْ خطاياهُ وَلَوكانَتْ مِثْلَ زَبَدِ البَحرِ ». (٤٦٨)

واتـە: هـەر كەسـێك لـە ڕۆژێـك دا(سـەد) جـار بڵـێ پـاكی و بێگەردیو ستایش بـۆ خوایـە، ئـەوا گوناهـەكانی دەسـڕێتەوە ئەگەر چی وەكو كەفی دەریاش وابێت.

٣-عَن أبي أيوب الأنصاري (ﷺ) عَن رَسول الله (ﷺ) « مَنْ قالَ: (لا إلهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَريكَ لَهُ. لَهُ المُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ وَهُوَ عَلَـى كُـلِّ شَيءٍ قَديرٍ ) عَشْرَ مِرارٍ كانَ كَمَنْ أعتَقَ أربعـةَ أنفُـسٍ مِـنْ وَلَـدِ إسماعيل ». (٤٦٩)

واتە: هەر كەسێك دەجار بڵێ: هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لە(الله) تاكی بێهاوەڵەو موڵك و ستایش بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێك دا بە تواناپە، وەكو ئەوە وایە كە چوار كەسی لە نەوەكانی ئیسماعیل پێغەمبەر(علیـه الـصلاة والـسّلام) ئـازادو ڕزگاركردبێت.

٤- عن أبي هريرة (ﷺ): قـال رسـول الله (ﷺ): « كَلِمَتانِ خَفيفَتـانِ عَلَى اللِّسـانِ . ثَقيلَتانِ في الميزانِ. حَبيبَتانِ إلى الرَّحْمنِ: ( سُبْحانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ سُبْحانَ اللهِ العَظيمِ ) ». (٤٧٠)

---

(٤٦٨) البخاري ٧/١٦٨ ومسلم ٤/٢٠٧١.
(٤٦٩) البخاري ٧/١٦٧ ومسلم ٤/٢٠٧١.
(٤٧٠) البخاري ٧/١٦٨ ومسلم ٤/٢٠٧٢.

واته: دوو ووشه هەن کە لەسەر زوربان سوکن‌و لە تەرازووی کردەوەکانـدا قورسـن‌و بـەلای خـواوە خۆشەویـستن ئـەویش بریتی‌یە لە ووتنی: پاکی‌و بێ‌گەردی‌و ستایش بۆ خوایە. پاکی‌و بێ‌گەردی بۆ خوای مەزن.

٥- عَنْ أبي هُرَيرَة (ﷺ) قالَ: قـالَ رسـول الله (ﷺ) : « لأن أقـولَ: ( سُبحانَ الله . وَالحَمْدُ لله . وَلا إلهَ إلاّ الله . وَالله أكبرُ ) أحَـبُّ إليَّ مِمَّا طَلَعَت عَلَيه الشَّمْسُ »[٤٧١]

واتـە: ئەگـەر بڵـێم پـاکی بێ‌گـەردی و سـتایش بـۆ خـوا و هـیچ پەرستراوێك نی‌یە بە هەق جگە لە(الله) و خـوا گەورەیە. خۆشترە بەلامەوە لە هەموو ئەو شتانەی کە خۆر بەسەری‌دا هەڵدێ.

٦- عَنْ سَعد(ﷺ) قال: كُنّـا عِنـدَ رسـول الله(ﷺ) فقـالَ: « أ يَعجِـزُ أحدُكُم ان يَكسِبَ كُلّ يوم ألفَ حسَنة ؟ فَسَألَهُ سآئلٌ من جُلَسـآئه: كَيفَ يَكسِبُ احدُنا ألفَ حَسَنةٍ؟ قالَ: يُسَبِّحُ مائة تَسْبِيحَة. فَيُكتَبُ لَهُ ألفَ حَسَنة أو يُحَطّ عَنهُ ألفَ خَطيئة ». [٤٧٢]

واتـە: سـەعد دەفـەرموێ: ئێمـە لـە خزمـەت پێغەمبـەری خـوادا بووین(ﷺ) و فەرمووی: ئایا کەس لە ئێوە هەیە بێ‌توانا بێ لەوەی کە هەموو ڕۆژێ هەزار چاکە دەست بخاتبۆ خۆی ؟یەکێ: لەوانەی کە دانیشتبوو پرسیاری لێ کرد: چۆن یـەکێك لـە ئێمـە دەتوانـێ

(٤٧١) مسلم ٢٠٧٢/٤.
(٤٧٢) مسلم ٢٠٧٣/٤.

هەزار چاکەی دەست بکەوێ؟ فەرمووی: سەد تەسبیحات ( سُبحان اللهِ )بکات هەزار چاکەی بۆ دەنوسرێ.یان هەزار گوناهی لێ هەلدەوەرێت.

٧- عَن جابر (ﷺ) عَن النّبيّ (ﷺ) قال: « مَنْ قَالَ ( سُبحانَ الله العَظيمِ وَبحَمده ) غُرِسَتْ لَهُ نخلَةٌ في الجَنّة » (١٧٣)

واتە: هەرکەسێك یەك جار بلێ پاکیو بێ کەم و کوڕیی‌و گەورەیی ستایش بۆ خوای مەزن، دارخورمایەکی لە بەهەشتدا بۆ دەڕوێت.

٨- عَن عبدالله بن قيس (ﷺ) قال: قالَ رَسول الله (ﷺ): « يا عَبدالله بنَ قيس ألا أدُلّكَ عَلَى كَنز منْ كُنوز الجَنّة ؟ » فقُلتُ: بلى يا رسولَ الله. قالَ: « قُلْ: لا حولَ وَلا قُوّة إلاّ بالله » (١٧٤)

واتە: ئەی عبدالله ی کوڕی قیس ئایا گەوهەرێك لە گەوهەرەکانی بەهەشتت پێبلێم؟ وتم: بەلێ ئەی پێغەمبەری خوا. فەرمووی: بلێ هیچ گۆڕان و هێزێك نییە مەگەر بەخوای گەورەوە.

٩- وە دەفەرموێت (ﷺ) : « أحَبُّ الكَلامِ إلى الله أربَعٌ: ( سُبحانَ الله. والحَمدُ لله. ولا إلهَ إلاّ الله. والله أكبَرُ). لا يَضُرُّكَ بأيّهنّ بَدَأتَ. وَلا تُسَمّينَ غُلامَكَ يَساراً. وَلا رَباحاً. وَلا نجيحاً. وَلا افلَحَ. فإنّكَ تقولُ: أثَمَّ هوَ ! فَلا يَكونُ: فيَقولُ: لا » (١٧٥)

(١٧٣) أخرجه الترمذي ٥/٥١١ والحاكم ١/٥٠١ وَصَحّحَهُ و وافَقَهُ الذهبي. وانظر صحيح الجامع ٥/٥٣١ وصحيح الترمذي ٣/١٦٠.
(١٧٤) البخاري مع الفتح ١١/٢١٣ ومسلم ٤/٢٠٧٦.
(١٧٥) مسلم ٣/١٦٨٥.

واته: خۆشەویسترین ووته بەلای خوای گەورەوە چوارە: پاکیی و بێ‌عەیبیی و سوپاس بۆ خوای گەورەو هیچ پەرستراوێک نییە بەهەق جگە لە(الله) و خوا گەورەیە. زیانت پێ‌ناگەیەنێ بەهەرکامێکیان دەست پێبکەیت.وە منداڵەکەت ناوەمەنێ ئاسان یان قازانج و سەرفراز و ڕزگار بوو. چونکە تۆ دەڵێی فلانیان(لەو ناوانە) لە ماڵە؟ ئەویش لەماڵ نەبێت دەڵێن:نەخێر لەماڵ نییە (واتە ئاسانیی و قازانج و سەرفرازیی و ڕزگاربوون لەماڵماندا نییە).

١٠- عَن سَعدِ بنِ ابي وَقّاص (رضي الله عنه) قالَ: « جاءَ أعرابيٌّ إلى رَسولِ الله (ﷺ) فَقالَ : عَلّمني كَلاماً أقولُهُ. قالَ: قُلْ: ( لا إلهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَريكَ لَهُ. اللهُ أكبرُ كَبيراً. وَالحَمْدُلله كَثيراً. سُبْحانَ اللهِ رَبِّ العالمينَ. لا حَوْلَ وَ لا قُوّةَ إلاّ باللهِ العَزيزِ الحَكيم ( قالَ: فَهؤلاءِ لِرَبّي فَمالي ؟ قالَ: « قُلْ: اللهُمَّ اغفِرْلي وَارحَمني. وَاهدِني. وَارزُقني ». (١٧٦)

واتە: دەشتەکییەک هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ووتەیەکم فێربکە کە بیڵێم. فەرمووی: بڵێ هیچ پەرستراوێک نییە بە هەق جگە لە(الله)تاکی بێ هاوبەشە. خوا گەورەیەو زۆر ستایشی خوا دەکەم. پاکیی و بێ کەم و کورتیی و گەورەیی بۆ پەروەردگاری جیهانیانە هیچ گۆڕان و هێزو توانایەک نییە مەگەر

(١٧٦) مسلم ٢٠٧٢/٤ و زاد ابوداود: ( فلما وَلّى الأعرابيُّ قالَ النبيُّ (ﷺ): « لقد مَلأ يَدَيهِ مِن الخَيرِ » ٢٢٠/١. واتە: کاتێ کە کابرا دەشتەکییەکە ڕۆیشت پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: هەردوو دەستی خۆی لە چاکە پڕ کرد.

بەخوای دەستەلأت داری کاربەجێوە، دەشتەکییەکە ووتی: ئەمانە بۆ (ستایش کردن)ی پەروەردگارمە. ئەی چی بۆ (نزا و پاڕانەوە)ی خۆمە؟ فەرمووی: بڵێ: خوایە لێم خۆش بەو ڕەحمم پێبکەو ڕێنمایم بکەو ڕۆزیم بدە.

١١- عن طارقٍ الأشجعي قالَ: كانَ الرَّجلُ إذا أسْلَمَ عَلَّمَهُ النبي (ﷺ) الصَّلاةَ ثُمَّ أمَرَهُ أنْ يَدعُوَ بِهؤلاءِ الكَلِماتِ: « اللهُمَّ اغفِرْلِي. وَارْحَمْنِي. وَاهدِنِي. وَعافِنِي وَارزُقْنِي » (١٧٧)

واتە: طاریقی ئەشجەعی دەفەرموێ: ئەگەر هەرکات پیاوێک موسڵمان بووایە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فێری نوێژی دەکردو پاشان فەرمانی پێدەکرد کە بەم ووشانە بپاڕێتەوە: خوایە لێم خۆش ببەو ڕەحمم پێبکەو ڕێنمایم بکەو بمپارێزەو ڕۆزیم بدە.

١٢- عن جابر بن عبدالله (رضي الله عنهما) أنَّ رسولَ اللهِ (ﷺ) قالَ: « إنَّ أفضلَ الدُّعاءِ الحَمدُللهِ. وَأفضَلَ الذِّكرِ لا إلهَ إلاَّ الله ». (١٧٨)

واتە: باشترین پاڕانەوە (الحَمْدُ للهِ)کردنە و باشترین ذیکر بریتییە لەوتنی(لا إلهَ إلاَّ الله).

---

(١٧٧) مسلم ٢٠٧٢/٤ وفي رواية لمسلم: « فإنَّ هؤلاءِ تَجمَعُ لَكَ دُنياكَ وَآخِرَتَكَ » واتە: ئەم ووشانە (چاکەی) دنیاو قیامەتت بۆ کۆدەکاتەوە.

(١٧٨) الترمذي ٤٦٢/٥ وابن ماجه ١٢٤٩/٢ والحاكم ٥٠٣/١ وصَحَّحَهُ وَوَافَقَهُ الذهبي وَانظُر صَحيحَ الجامع ٣٦٢/١.

١٢- وە دەفەرموێت (ﷺ): « الباقياتُ الصَّالحاتُ: ( سُــبحانَ اللهِ. الحَمْدُللهِ وَلا إلهَ إلاّ اللهُ. وَاللهُ أكبرُ. وَلا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إلاّ باللهِ » (٤٧٩)

واتە: ئەو چاكانەی كەدەمێنێتەوە(٤٨٠) بریتیە لە ووتنی: پاك و بێگەردی بۆ خوایەو ستایش بۆ خوایەو هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە(الله)و خوا گەورەیەو گۆڕان و هێزێك نیە مەگەر بەخوای گەورە.

## پێغەمبەری خوا (ﷺ) چۆن تەسبیحاتی دەكرد؟

عَن عَبْدُاللهِ بنِ عَمرو( رَضيَ اللهُ عَنهُما) قالَ: « رَأيتُ النَّبـــيَّ(ﷺ) يَعقِدُ التَّسبيحَ بِيَمينِه » (٤٨١)

واتە: پێغەمبەری خوام(ﷺ) بینی بە دەستی ڕاستی تەسبیحاتی دەكرد.

---

(٤٧٩) أحمد برقم (٥١٣) بترتيب أحمد شاكر وإسناده صحيح وانظر مجمع الزوائد ٢٩٧/١ وعزاه ابن حجر في بلوغ المرام من رواية أبي سعيد إلى النسائي و قال: صَحَّحَهُ ابن حبّان وَالحاكم.

(٤٨٠) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ... وَالبَاقِيَاتُ الصَّالِحَاتُ خَيرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيرٌ أمَلاً ﴾ (سورة الكهف:٤٦).

(٤٨١) أخرجه أبوداود بلفظه ٨١/٢(١٥٠٢) و صَحَّحَهُ الألباني في صحيح الجامع (٤٩٨٩) والترمذي ٥٢١/٥ وانظر صحيح الجامع ٢٧١/٤ (٤٩٨٩).

عن يسيرة الصحابية(رضي الله عنها) « أنَّ النَّبـيَّ(ﷺ) أمـرَهُنَّ أن يراعينَ التَّسبيحَ وَالتَّقديسَ وَأن يَعقِدنَ بالأناملِ فـإنَّهُنَّ مَسؤولاتٍ مُستَنطقات ».[482]

واتـه: لـه يەسـيرەی ژنـه صەحابەی بەڕێزەوە(ڕەزای خـوای گەورەی لێ بێ) ڕیوایەت کراوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی پێکردون کە ئاگایان لە تەسبیحات و بە بەرزو پیرۆز ڕاگرتنی خـوای گـەورە بێـت و بـە(ئەنامیلـەکانیان) ئـەنجامی بـدەن ( کـە بریتیەیـە لـەو ناوسـاویانەی کـە لەسـەر سـەری هـەموو پەنجەیـەك دا هەیـە) چـونکە لـە ڕۆژی دوایی‌دا پرسـیاریان لێ دەکرێت و دێترێنە گۆو دەبنە شایەت.

## ولله الحَمدُ وَالمِنَّة

سُبحانَكَ اَللهُمَّ وَبِحَمدِكَ اشهَدُ انْ لاَ إلهَ إلاّ أنتَ أستَغفِرُكَ وَأتُوبُ إلَيكَ

---

(482) رواه ابوداود(1501) والترمذي بإسناد حَسَنٍ وَحَسَّنَهُ الالباني في صحيح الجامع(4087).

# سەرچاوەکان

١- مختصر تفسير ابن كثير. اختصار وتعليق: محمد علي الصابوني ١٤٠٦هـ - ١٩٨٦م.

٢- الأذكار... محي الدين ابي زكريا يحيى بن شرف النووي طبعة سنة ١٩٨٢.

٣-نتائج الأفكار في تخريج احاديث الأذكار. جزء/١ . ابن حجر العسقلاني.

٤- رياض الصالحين... محي الدين ابي زكريا يحيى بن شرف النووي.

٥- فقه السنة... لسيد سابق سنة ١٣٩١-١٩٧١.

٦- الأدلة الرضية لمتن الدرر البهية في المسائل الفقهية... محمد بن علي الشوكاني.

٧- الدعاء ويليه العلاج بالرقى من الكتاب والسنة... سعيد بن علي بن وهف القحطاني.

٨- حصنُ المسلم من اذكار الكتاب والسنة.... القحطاني... طبعة فريدة ومضبوطة بالشكل.

٩- سبحانكَ اللهُمّ... مهندس جميل إبراهيم.

١٠- اذكار الصباح و المساء الصحيحة( من المأثورات ومن صحيح الكلم الطيِّب) الدكتور: عبدالله عزّام.

١١- تحفة الذاكرين... محمد بن علي الشوكاني.

١٢- فتاوى مهمة تتَعَلّقُ بالصلاةِ...عبدالعزيز بن عبدالله بن باز.

١٣- احكام العيدين في السنة المطهرة... علي حسن علي عبدالحميد الحلبي الأثري.

١٤- اذكار اليوم و الليلة بضبطة مزينة بشرح غريب الألفاظ...... إعداد وترتيب: علاءالدين بن يوسف العتيبي ١٤١٦هـ.

١٥- صحيح الكلم الطيِّب... لشيخ الإسلام ابن تيمية. بقلم محمد ناصرالدين الألباني ١٤٠٧-١٩٨٧.

١٦- الصحيح المسند من اذكار اليوم والليلة... تأليف: مصطفى بن العدوي احمد. راجَعَهُ: مُقبل بن هادي الوادعي ١٤١٦هـ - ١٩٩٥م

١٧- المُنتقى من الأدعية والأذكار.. إعداد: محمد بن فهد الصبيحي. دار الخضيري. الطبعة الخامسة ١٤٢١ هـ.

١٨- وە چەند سەرچاوەیەکی تر......

# ناوەرۆك

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|

بەشی حەوتەم:هەندێ کاتی تری جیاواز:

# هەندێك لە بەرهەمەكانی نوسەر

١- قەڵای موسڵمان لە زیكرەكانی شەوانەو رۆژانە لە قورئان و سوننەتدا.

٢- رووخسارو رەوشتە بەرزەكانی پێغەمبەری خوا(ﷺ).

٣- چارەسەر بە دوعا لە قورئان و سوننەتدا.

٤- راستێتی جنۆكە.

٥- نیشانە بچوكەكانی رۆژی دوایی.

٦- نیشانە گەورەكانی رۆژی دوایی

٧- قیامەتی گەورەو نارەحەتییەكانی (دوو بەش).

٨- ئەحكامەكانی جەژن و ئادابەكانی.

٩- حوكمی نوێژنەكەر.

١٠- ئامۆژگارییەكی زێرین بۆ ئەو كۆمەڵانەی ئیسلامین.

١١- دۆستایەتی و خۆبەری كردن لە ئیسلامدا.

١٢- زنجیرەی چیرۆكە صەحیحەكانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)/ زنجیرەی(١)و (٢).

١٣- هەڵوەشێنەرەوەكانی ئیسلام و ئیمان.

١٤- سوودەكانی هاورێیەتی پیاوچاكان.

١٥- بڵاوبوونەوەی داوێن پیسی..هۆكارو چارەسەر.

١٦- دیاردەی مەی خواردنەوە لە ناو گەنجاندا.

١٧- دامەزراوی

١٨- زمانت بە یادی خوای گەورە پاراو بكە.

١٩- بۆ خوشكێكی لەچكە بەسەر لەم مانگەدا.

٢٠- دیاردەی ساردبوونەوە لە دین

٢١- پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) وەك ئەوەی ببیبینی.

٢٢- حوكمی سەرلێترە.

# حصن المسلم

## من

## أذكار اليوم والليلة

## من

## الكتاب والسنة

خوای گـــەورە فـــەرمانی کرد بە یەحیای کوڕی زەکەریا (علیه الصلاة والسلام) بە پێنج ووشە کە کاری پێ بکات و فەرمانیش بدات بەبەنی ئیسرائیل تـــا کاری پێ بکەن وە لەوانە تیایدا هاتووە... وە فەرمانتان پێ دەکەم کە زۆر یادی خوای گەورە بکەن، چونکە نموونەی ئەمە وەك پیاوێك وایە کە دوژمن بە پەلە شوێنی بکەون و ئەویش خۆی بخاتە ناو قەڵایەکی پتەوو خۆی تیدا حەشار بدات، وە بەندەش پارێزراوترین کاتی لە شەیطان ئەو کاتەیە کە لە ذیکرکردنی خوای گەورەدا بێت.

حدیث صحیح انظر (صحیح الوابل الصیب) ص ٣٨-٤٠